# رۆحی کورد لە بن دەستی

## ناسیۆنالیزم، ئیسلامیزم و مارکسیزم دا



ناسیۆنالیزم

ئازاد قەزاز

2008

# ڕۆحی کورد لە بن دەستی

## ناسیۆنالیزم، ئیسلامیزم و مارکسیزم دا

لێکدانەوەیەکی سایکۆپۆلیتیکانە ی چارەکە سەدەیەک

لە ڕەوشی سیاسی کورد

ئازاد قەزاز

٢٠٠٧

ناوی کتێب: رۆحی کورد له بن دەستی ناسیۆنالیزم،
ئیسلامیزم و مارکسیزم دا
بابەت: لێکۆڵینەوە
ناوی نووسەر: ئازاد قەزاز
بەرگ: محمد نەورەس
ساڵی چاپ: ٢٠٠٨
نۆرەی چاپ: یەکەم
ژمارەی سپاردن: ژمارەی ٦٢٧ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ
تیراژ:١٠٠٠
نرخ:٢٠٠٠ دینار
چاپ:چاپەمەنی پەیوەند

# نـــــاوەڕۆك

# سەرەتا

چوونەوە بە مێژووی کوردا لە گۆشەنیگای سایکۆپۆلیتیکەوە، گرنگیەکەی لەچیدایە؟

بۆ ئەوەیە مرۆڤی کورد خۆی بناسێتەوە، چونکە خۆناسینەوە لە ئاڕاستەکردنی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی تا بلێی فاکتەرێکی گرنگە. کورد تا هەنوکەش ستایشی ڕابوردوی خۆی دەکا، نەک ڕەخنە لەو ڕابوردووە بگرێت. ئاری سەرەکی سایکۆلۆژیا دروستکردنەوەی تاکە و سایکۆپۆلیتیکیش لەگەڵ ئەو دروستکردنەوەیەدا ئاراستەی سیاسیش دیاریدەکات.

لە هاوینی نیمسالّدا (٢٠٠٧) کتێبێکم بە ناوی (سایکۆپۆلیتیک) بلاوکردەوە کە ەەر بە هەمان ئاراستەدا دەروات و ئارادەیەکیش وەلامی ئەو پرسیارەی سەرەوەش دەداتەوە. واتە لە گۆشەنیگای مرۆڤبوونەوە لە نەتەوەی کورد دەڕوانم و دەمەوێ ئەوە بپشکنم، بۆ لە ناو نەتەوەی کوردا، تا هەنووکەش ڕێبازێکی لەو چەشنە ـ ڕەخنە لە خۆ گرتن بە ئاراستەی

مرۆڤبوون ـ سەریهەڵنەداوە؟ لەوێدا بەگشتی و بە شێوەیەکی تیژپەڕ بەگشت مێژووی کوردا دەچمەوە. دەمەوێت لەو کانینەی کە ناوی کوردە بکۆڵمەوە و وەڵامی ئەم پرسیارەش وەربگرمەوە:
**بۆ ئەم نەتەوەیە لە سەرهەڵدانیەوە تا ئێستاش لەبواری خۆناسین، ئەوا نزیکەی سێ هەزار ساڵە، گەر بە عەرەب و تورک و فارس بەراوردی بکەین، لە ئاستێکی نزمدایە؟**

ئەم کتێبەش کە ئێستا لەبەردەستتدایە، هەر بەو ئاراستەیەدا دەڕوات کە کتێبی پێشوتر پێیدا رۆشتووە. بەڵام ئەم کتێبەیان لە شوێنکاتێکی گچکەتر لە دۆخی بونیادی کورد دەکۆڵێتەوە. دەتوانم بڵێم ئەم کتێبەیان شرۆڤەکرنی ئەویدیە و نموونە هێنانەوەیەکە تا مەبەستی (سایکۆپۆلیتیک) رونتر بێتەوە و لەوە تێبگەین، چۆن ستراکتور و پێکهاتەی سایکۆلۆژی مرۆڤگەلی کورد، لە ململانێکانیدا بۆ خواستە رەواکانی، ئاراستەی سیاسەتێکی هەڵەی گرتۆتەبەر.

پێداچوونەوە بە خۆدا بە میتۆدی زانستی، هەم بۆ تاک و هەم بۆ کۆمەڵیش تا بڵێی گرنگ و

بەنرخە، چونکە لەویوە مرۆڤ خۆی دەناسێ و هەر لەویوەشەوەرێگای ژیان دەدۆزێتەوەو جێبەجێکردنی خواستەکانیش مرۆیانە خەباتی بۆ دەکا. **واتە لە بەخۆدا چوونەوەدا یەکەم؛ ناسنامە دەخولقێنرێت، دووەم؛ گرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکان دەست نیشاندەکرێن و سێیەم؛ ئاراستەیەکی دروست بۆ ژیان دیاریدەکرێت.** بەمەرجێک ئەو بەخۆداچوونەوەیە زانستیانەو مەعریفیانە بێت، نەک بۆ خۆستایشکردن و خۆجوانکردن بێت. جا لەبەرئەوەی هەڵسوڕێنەرانی سیاسەتی کوردی و خولقێنەرانی ڕوداوە تراژیدئامێزەکانی کورد، هەر ستایشی خۆیان و ڕابوردویان دەکەن، ئەوا ناچارین ئێمەی زانستخوازان بە میتۆدی زانستی بەخۆماندا بچینەوەو ڕەخنەبگرین و خۆمان بەخۆمان بناسێنینەوە.

لەسەرێکی تریشەوە گەر لە ڕووی کەسێتی خۆمەوە لەم مێژووە بڕوانم، ئەوە مافی خۆمە بەم مێژووەدا بچمەوە، چونکە خۆیشم تێکستێکم لەم کۆنتێکستەدا و وشەیەکم لەو دێرە مێژووییەدا.

هەرچەند ئیمرۆ من خۆم ئەوەم کە ئێستا هەم، وەلێ خۆیشم بەرهەمی ئەم مێژووەم. واتە پێش هەرکەسێک من ناسنامەی خۆم و هەڵەکانی خۆم دیاریدەکەم.

بۆ ئەوەی بابەتیانە مێژووی کورد بخوێنمەوە، دەبێ ساتی خوێندنەوە و ئۆبسەرڤێرەکردن لەو مێژووە بچمە دەرەوە و هەرکاتێ لەو کارە بوومەوە بێمەوە ناوەوە، تا بتوانم دەسکاری پارچەکانی ئەو ڕۆحە شپرزەیەی کورد بکەم و خۆی بە خۆی بناسێنمەوە و بەخۆی ئاشنا کەمەوە. هەست دەکەم تا ئەم بە خۆدا چونەوەیە ئەنجام نەدەم، ناتوانم هەنگاوی پراکتیکی بۆ گەیاندنی ئەو پەیامەی لەلام گەلاڵە بووە، بنێم. ئەم کتێبەو کتێبەکەی پێشووش تاڕادەیەکی باش مەبەستی منی لە مەڕ نەتەوایەتی ئاشکرا کردووە. کتێبی داهاتووش مەبەستم لەمەڕ ئاین و خودا ئاشکرا دەکات. چەمکی خوا لای من هەنوکە ئەو چەمکە تەقلیدیە نیە کە لە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا باوە، چونکە ئەم چەمکە بۆ من بەتەواوەتی ترانسفۆرمێرە ( گۆڕانێکی بنەڕەتی) بەسەردا هاتووە.

لە کتێبی سایکۆپۆلیتیکدا بە شێوەیەکی گشتی گفتوگۆمان لە مەڕ ناسنامەی کورد کرد. لەم کتێبەدا

گفتوگۆکەمان تایبەتیتر کردۆتەوە. هەوڵدەدەم لە کتێبی داهاتودا سەبارەت بە ئاین تایبەتیتر قسە لەسەر خودی خودا بکەم و چۆن کەسێتی کورد بەو ئاراستەیەدا خۆی بنیاد بنێتەوە. لەوێدا ئەم پرسیارە دەوروژێنین: **داخۆ لەم سەردەمەدا کورد دەتوانێ لە دەرهاویشتەی خۆیەوە لە چەمکی خوایەتی بڕوانێت و لەو بوارەدا مەعریفەیەکی بەرزتر لە چاو تورک و فارس و عەرەب بهێنێتە کایەوە؟** لە هەمانکاتدا هەوڵدەدەین لەو هۆکارانەش وردبینەوە بۆ پرۆژەی مارکسیسم لە ناو کوردی باشووردا دەسەوسانە؟ و پێشنیارێکیش دەکەین بەڵکو کورد بتوانێت لەو گیرخواردنە دەربازبێت.

# دەسپێک

جگــە لــە مــرۆڤ گــشت بوونەوەرێــکی دی ئاراســتەیەکی یــەک ڕەهەنــدی دەخــوازێ، ئــەویش ڕەهەنــدی مــاددی یــان بــە زمانێکی تــر ڕەهەندێکی غــەریزی، بایــەلۆژی، فیــسیۆلۆژیە، ئــەم ڕەهەنــدە دەکرێت بخرێتە ژێر کۆنترۆڵی تاقیگاوە و لـە دیدی زانستێک لـە زانستەکان مامەڵـەی لەتەکدا بکرێت.

مـرۆڤ جیـا لـەم بوونەوەرانـە جگـە لـەو ڕەهەنـدە ماددیــــە، ڕەهەندێــــکی دی ســــەرتاپای ژیــــانی داگیرکــردووە و دەتــوانین بــە زمــانی ســایکۆلۆژی وشەی هەست و نەست و بە زمانی ئایین وشەی ڕوح و بــە زمــانی فەلــسەفەش وشــەی مەعریفــەی بــۆ بەکاربهێنین. ئەم ڕەهەندە هێندە کاریگەرە دەتوانم بڵێم ئاراستەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایـەتی و بگـرە ئابووری مرۆڤایەتیش دیاریدەکات.

ئەم کاراکتەرە ڕۆحیە، هەست و نەستی مـرۆڤ پێکدەهێنـێت و چۆنـێتی مرۆڤبـوونی ئـەو مرۆڤـەو چارەنوس و هەنگاوەکانی ژیانی دیاری دەکات. ئەم کاراکتــەرە ڕۆحیــە شتــێک نیــە هــەروا لــە خۆیــەوە

بەخشرابێت، بەڵکو لە ناو پرۆسەیەکی مێژووییدا دەخولقێت. گرفت و ئاڵۆزی ئەم هەست و نەستە کە دوو ڕەهەندی سەرەکی پێکهاتەی مرۆڤن بە هێڵێکی ڕاست و یەک ئاستدا ناڕوات، بەپێچەوانەوە، بە هێڵێکی پێچاوپێچ و بەرزو نزمدا تێدەپەڕێت. چونکە مرۆڤ هەڵگری کاراکتەرێکی ڕوحی و دەروونی ئەوتۆیە کە بەبەردەوام لەگۆڕاندایە، واتە هەڵگری کاراکتەرێکی دینامیکییە کە ژینگە، دەوروبەر، ڕووداو وسروشت ئەو کاراکتەرە دەخاتە ژێرکاریگەری خۆیەوە. کاراکتەری مرۆڤیش وایە کە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە سروشت و دەروبەر و ڕووداو بەو ئاراستە و ئاقارەدا بەرێت کە خودی ئەو مرۆڤە خۆی تێیدا هەست بە ئارامی و ئاسودەیی و حەوانەوە دەکات. هەرکاتێ مرۆڤ بەو کاراکتەرە ڕۆحیەی خۆی نەزانێت، یان لەوە هۆشیار نەبێت کە ئارامی و ئاسودەیی ڕاستەقینە لە کوێدایە، ئەوا ئارامی و ئاسودەیی درۆینە بۆ خۆی ساز دەکات و لە ڕێگەی وەهم و خەیاڵەوە دەیڕازێنێتەوە. وەلێ هێندە نابات واقع هەموو ئەو خەیاڵپلاوانەی هەڵدەوەشێنێتەوە. بە کورتیەکەی

دەمەوێ ئەوە بدرکێنم کە مرۆڤ و کەلتووری مرۆڤ و کۆمەڵگە، هەڵگری کاراکتەرێکی ڕوحی و هەست و نەستیکە، گەر هۆشیارانە مامەڵەی لەتەکدا نەکرێت، هێندە نابات ئەو مرۆڤگەلە ناهوشیارە دووچاری شکستێکی تۆقێنەر دەبێتەوە.

لێرەدا ئەمەوێ ئەوە بڵێم کورد لەو ڕۆژەوەی کە وەک بونەوەرێکی کوردی لە مێژوودا سەری هەڵداوە، هەتا هەنووکەش نەیتوانیوە ئەو ڕەهەندە، ئەو کاراکتەرە نادیارە، هەموار و لەبار بکات و بتوانێ هۆشیارانە مامەڵەی لە تەکدا بکات. گشت چارێک کە هەلێک بۆ کورد هەڵدەکەوێت و دەشێ ئەگەرێک بێت تا لەوێوە بتوانێ هەنگاوێکی جددی بنێت و بەرەو ئاسۆی هەقیقەت هەڵکشێت و سەرەتایەک بێت بۆ خۆدامەزراندن، کەچی بە پێشڕەوی سەرکردەکانی هەنگاوی ناواقعی دەنێت و ژینگەیەکی درۆینە و ئاسوودەیەکی ساختە دەخولقێنێت. دەرەنجام شکستهێنانەو، ئەمجا پرسەگرتنەو هەڵسەنگاندنیش تاوانبارکردنی ئەویدیە و بەزەیی هاتنەوەیە بە خۆدا و سەرهەڵدانی هەستی بەقوربانیبوونە.

بێ ئەوەی زۆر دوورکەوینەوەو بە ناو مێژووی دێرینی کوردا بچینەوە، دەشێ واقعی ئەمڕۆی کوردی باشوور ئەگەر بێتوو بە چاوێکی ووردبین و زانستیانە لێبڕوانین، زەمینەیەک بۆ بۆ تێگەیشتن لەم دەستپێکە. مەبەستم ئەو واقعەیە کە لە کۆتایی سەدەی ڕابردووەوە کورد خۆی تێدا دەبینێتەوە. واتە ئەو سەردەمەی کە پارتی و یەکێتی و پارتەکانی تری کورد گەمەی خۆیانیان تێدا کردووە و تا هەنوکەش ئەو گەمەیە بەردەوامە.

دیارە گەڕانەوە بۆ مێژووی پێش ڕاپەڕین، تیشکێک دەخاتە سەر ئەوەی ئەمڕۆ لە کوردستانی باشوور لە خوانە. دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی ئێران بە چەند لایەکدا لەسەر کوردی باشووری کوردستان ڕەنگدانەوەیەکی بەرچاوی بووە. لێرەدا مەبەستی من ئەوە نیە باس لە چاکی و خراپی سیاسەتی کۆماری ئیسلامی ئێران بکەم، هێندەی ئەوەم مەبەستە کە باس لەو تێوەگلانەی کورد لەو سیاسەتە و بە چ ئاراستەیەکدا کوردی باشووری بردووە، بکەم. بزاڤی نەتەوەیی و ئیسلامی کورد کە ئێستە لە گۆڕەپانی باشووری کوردستاندا چالاکن،

گـشتیان لـه سیاسـەتی ئـەو کۆمـاری ئیـسلامیە تیوەگلان و تیوەی ئالآن. ئەم تیوەگلانە لە کۆتاییدا زیانـێکی گـەورەی بەئاراسـتەی سیاسـەتی کـوردی باشـوور گەیانـد. مەبەستیـشم لـە کـوردی باشـوور هەموو تاکەکانی ئەو ناوچەیەیە بە ئیسلامی سیاسی و ئیـسلامی جیهـادی، ڕێـبازی چـەپ و بزاڤـی نەتەوەییەوە. مەبەستم ئەوە نیـە لێرەدا پەیڕەو و پرۆگرامی ئـەو پارتانـە هەڵسەنگێنم. نەخێر، تـەنها مەبەستم ئەوەیە ئەو پارت و گروپانە تا چ ڕادەیەک سـودیان بـە پـڕۆژەی نەتەوەیـەک گەیانـدووە. پرۆژەی نەتەوەیەک مەبەستم ئەو پرۆسە سروشتی و ئاسـاییەیە کـە نەتەوەیـەک بـەرەو نەتـەوەبوون بەرێـت و تاکـەکانی ئـەو نەتەوەیـە لـە نـاو ئـەو چوارچـێوە نەتەوەییـەدا، هەسـت بـە ئاسـودەیی دەرونی و ئارامی ڕوحی بکەن.

نەتەوەبوون قۆناغێکە لە قۆناغەکانی بە مرۆڤ بـوون. واتـە تاکـێک هەسـت بـە بـوونی خـۆی وەک تاکێک دەکـات و دەیـەوێ خـۆی لـە هـەموو کـۆت و بەندێک ئازاد بکات. هەر ئەم تاکە لـە هـەمان کاتتـدا هەست بە بوونی ڕاستەقینەی خۆی لە ناو گروپێکدا

دەکات کە سنوور بۆ ئەو ئازادیە دادەنێت و ئەوکات ددرەنجـــــامی ملهلانــــــێی ئــــەو تاکانــــــەی هوشـــیاربونەتەوەو ئـــەو جـــەماوەرەی کـــە ئـــەو هوشـــیاربونەوەیەی پـــێ هەرسناکرێـــت، هەســـتی نەتـــەوەبوون و ئینتمـــابوون  بۆیـــەک ڕەچـــەڵەک و مێژووی هاوبەش گەشەدەسێنێت. ئەم نەتەوەبوونە لە ئەنجامی هۆشیاریەکی ڕاستەقینە سەرهەڵدەدات، چونکە بـە بێ هۆشـیاربوونەوەی تاکـێک لـە خـودی خۆی و دەوروبەر و ئەویدی، ئەو نەتەوەیە بونـێکی سـەرەتاییە کـە نـاتوانرێ هـیچ جـۆرە پڕۆژەیـەکی سیاسـیانەی ئـاڵۆزی لەسـەر بنیـات بنـرێ. کـاتێ ئـەم نەتـــەوە بـێ پـرۆژەو سـەرەتاییە دەکەوێـتە بـەر تەوژمی نەتەوەیەکی خاوەن پرۆژە و خاوەن پەیام، تاکەکانی ئەو نەتەوە سەرەتاییە لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچ دەکـات. مـرۆڤ دەبـێ بـە پرۆسـەیەکی سـایکۆلۆژی قوڵـدا تـێپەڕێت تـا بتـوانێ لـەو لەگـەڵ خۆبردنـەدا هوشیاربـێت و هوشـیارانە مامەڵـە لـە تـەک دۆخـی بەنەتەوەبوونیـدا بکـات. نەتـەوەبوون مەبەسـتمان مرۆڤگەلێک لە ئاستی خێزان، خێڵ و هـۆز دیـدی بـۆ ژیان بەرزتر بێتەوە و زۆرتـرین ژمـارەی مـرۆڤ لـە

بیرکردنەوەیدا بگریتەوە، کە دەتوانم بلێم سەر بەرەو هیومانیزمی بکێشێت، بەبێ ونکردنی تایبەتمەندێتی مرۆڤەکان. واتە نەتەوەبوون خۆ بەندکردن نیە لە چوارچێوەیەکدا، هێندەی ئازادبوون و کرانەوەیە بۆ ئەویدی.

لێرەوە هەوڵ دەدەین ئەوە شیبکەینەوە، تا چ رادەیەک پرۆژەی کوردی، لە کوردستانی باشور لەو سەردەمەی کە کۆماری ئیسلامی سەری هەڵداوە هەتا هەنووکە، بە گشت لایەن و پارت و گروپەکانیەوە توانیویێتی ئاراستەی نەتەوەبوونی کورد گەشە پێبدات. ئەوەی پێویستە بیڵێم ئەوەیە کە ئەم تێروانینەی نوسەر پشت نابەستێت بە هیچ ئامارو لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی، بەڵکو پشت ئەستووره بەو پاشخانە رۆشنبیریەی کە تا هەنووکە بۆی رەخساوە و بەو پێیە دیاردەو رووداوەکان دەخوێنێتەوە، ئەمەو سەرەرای ئەوەی کە نوسەر خۆی لەو سەردەمەو شوێنکاتەکاندا واتە لە کوردستانی باشوردا ژیاوەو ئەم رِوداوانە گشتی سەرنجی راکێشاون.

تاکەکانی کورد لە ڕووی سیاسیەوە بەم شێوەیە پۆلێن دەکەم:

١- کۆمەڵێک تاکی کورد بانگەشەی نەتەوایەتی دەکەن، کە دەتوانین پارتی و یەکێتی لەم کۆمەڵەدا پۆلێن بکەین.

٢- کۆمەڵێک بانگەشە بۆ ئیسلام دەکەن. کە لە یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان و بزوتنەوەی ئیسلامی و کۆمەڵی ئیسلامی دا پۆلێن دەکرێن.

٣- کۆمەڵێک بە چەپگەرا ناسراون. چەپگەرایی گشت ئەو پارتانە دەگرێتەوە کە بیری مارکسیزم کاریگەری لەسەریان جێهێشتووە.

ئەم پۆلێنکردنە بۆ ئەوە نیە کە لەم پارت و ڕێبازانە بکۆڵمەوە، هێندەی مەبەستمە لە ڕوانگەی نەتەوایەتی و ئایینداری و مارکسیەتەوە باروودۆخی ئەمڕۆی کورد بخوێنمەوەو بەو ڕابردوەی ببەستمەوە کە نزیکەی چارەکەسەدەیەکی بەسەردا تێپەڕیوە. خوێندنەوەکەمان بەم پرسیارە دەست پێدەکەین:

**ئایا ئەو پارتانـەی بانگەشـەی نەتەوایـەتیان کرد بۆ گەیشتنی کورد بـە ئامانجـەکانی، ڕێـبازی نەتەوەییان گرتۆتەبەر؟ ئایا پارتـە ئیـسلامیەکان ڕێـبازی ئایینیـان گرتۆتەبـەر ؟ ئایـا چـەپەکان ڕێـبازی مارکـسیزمیان لەمـەڕ ئـاین و فەلـسەفە گرتۆتەبەر؟ واتە جەوهەری ئەم ڕێبازانە بزوێـنەر بووە یان لاسایی کردنەوە؟ لـەناو ئـەم ڕێـبازانەدا خودی مرۆڤ ئامانج بووە یان عەقیدە؟ ئایا ڕۆحـی کورد لەبن دەستی ئەم ڕێبازانەدا حەساوەتەوە یان شپرزەتر بووە؟**

لـەو کاتـەی کـە کۆمـاری ئیـسلامی و ڕژێـمی عـێراق لەگـەڵ یەکـدی لـە جەنگـدا بـوون، پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان (پ.د.ک) و یەکـێتی نیـشتمانی کوردسـتان (ی.ن.ک) چـالاکی خۆیـان دەستپـێکرد بـۆوە. مەبەسـتم لـە چـالاکی؛ چـالاکی جەنگاوەرانەیـە نـەک شۆڕشگـێڕانە. جگـە لـەوەی وەک هـەموو لایـەک دەیـزانن، پـارتی و یەکـێتی هـێندەی دژ بـە یەکـدی جـەنگاون و لـە یـەکتریان کوشـتوە و یـەکتریان ئەشـکەنجەداوە، هـێندە

زەبریان بە ڕژێمی عێراق نەگەیاندووەو تا ئێستەش ئەو دژایەتی کردنە بە شێوازێکی تر هەر بەردەوامە. ئەوەی گرنگە ئاماژەی پێبکەین و تیشکی بخەینەسەر ئەو پەیوەندییەیە کە ئەم دوو پارتە لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا بوویانە، و تا چ ڕادەیەک ئەو پەیوەندییە سود یان زیانی بە پرۆژەی نەتەوەبوونی کورد گەیاندووە.

لەو سەروبەندەدا ئیسلامیەکانیش بە جیهادی و سیاسیەوە لە ئێراندا دەژیان و پەیوەندی ئەوانیش هەروەک پارتی و یەکێتی دژ بە ڕژێمی عێراق پەیوەندییەکی ئۆپۆزسیانە بوو. هەرچی مارکسیستەکانە کە دەشیا لە ڕێگەی فکری مارکسیەوە -وەک فەلسەفەیەکی واقعی- مرۆڤی کورد لە واقعی ئەو ڕۆژگارە هۆشیاربکەنەوە، کەچی ئەوانیش بە ئاقارێکدا ڕۆشتن بە هیچ جۆرێک تێبینی پێکهاتەی مرۆڤی کوردیان پێنەکرا و لە بری ئەوەی پرۆژەی نەتەوەیی و ئاینی بە ئاقاری مرۆڤ دۆستیدا بەرن، بە پێچەوانەوە، ئایینداری و نەتەوایەتیان بە پرۆژەیەکی دروست نەدەزانی.

# بەشی یەکەم

## ڕۆحی کورد لەبن دەستی ناسیۆنالیزم دا

هـەروەک لای هــەمووومان ئاشـکرایە، زیـاتر لــە سەدەیەکە کورد لەوە هۆشیار بووەتەوە کە مـافی ئەوەی هەیـە خـاوەنی دەسـەڵات و بـوونی خـۆی بـێت. مرۆڤـی کــورد هەسـت بــەوە دەکـات کــە سنووری جوگرافی و زمـان و مـێژووی تایبـەت بـە خۆی هەیەو لە نەتەوەکانی تری دەوروبەری جیای دەکاتــەوە. ئـەم هەسـتە هەسـتێکی سـەرەتایی و سادە و سۆزداریە، بۆیە گەر ئـەم هەسـت و سـۆزە گەشـە نـەکا و پـەرەی پێنەدرێت بـە سـێ ئاقـاردا مەترسیدارە. یەکەم؛ ئـەم هەسـتە ناچـارت دەکـات بەبەردەوام بەرامبەر بە کاری دوژمنانەی ئەویدی، کاردانەوەیــــەکی ڕوکــــەش و ســــۆزداری و هەڵـچوووانەت بـێت، ئەمـەش زۆرجـار ئاکامەکـەی خراپ بەسەر خودی خۆتدا دەشکێتەوە و پرۆژەی بەنەتەوەبوون بەرەو دواوە دەبات و ماڵوێرانی و شکستی لێدەکەوێتەوە. دووەمیـان؛ مەترسیەکەی

لەوەدایــە ئامــانج کــە نەتەوەبوونــە لەنــێوەند هۆکارەکانــدا -کــە دەکــرێ لــە خزمــەتی ئــەو ئامانجەدا بێت- ون دەبێت و پێوەرەکە لینگەوقوچ دەبــێتەوە، لــەبری ئــەوەی خــەم لــە مرۆڤبــوونی مرۆڤی کورد بخورێ، مرۆڤــی کــورد بــە بــەردەوام دەکرێتە قوربانی بۆ دروشم و جوگرافیا و مــێژوو و ڕابردوو. سێهەم مەترسیەکەی لەوەدایە گەر ئەو جــۆرە هەســت و ســۆزە نەتەوەییــە پــەروەردە نەکرێــت، مــرۆڤ بــەرەو ڕەگــەز پەرســتی و شۆڤێنیەت بەرێت. کە دەسەلاتیشی دەسکەوت -بــە هــەر شــێوەیەک بــوبێ- هــەمان تــێڕوانینی دوژمنەکــەی- بــێ نرخکــردن و ناشــرینکردنی ئەویدی- لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت. ئەم حاڵەتە سۆزدارییە پەرچەکردارەی کورد، کــە لەســەرەوە تیشکمان خستە سەر، تــا هەنوکــەش بەردەوامــە و هــیچ گۆڕانــێکی بەســەردا نــەهاتوە. لــێرەوە هەوڵدەدەین ئەو حاڵەتە لە نــاو سیاســەتی کــوردی و لــەم چــارەکە سەدەی ڕابــردوودا دەســت نیــشان بکەین.

تێکشکانی جەنگی بارزانی ساڵی ۱۹۷۵ بواری بۆ تاڵەبانی خۆشکرد کە جارێکی تر بانگەشە بۆ بۆچوونەکانی خۆی بکاتەوە. هەموو ئاگادارین لەوەی کە تاڵەبانی پێشتر لە ئاست بەرزانیدا شکستی خوارد و بێ دەنگ و کپکرابووەوە. هەرچەن بە بۆچوونی من بۆچوونەکانی تاڵەبانی تەنها بە وشە و دروشم لە بیروبۆچوونی بارزانی جیاواز بوو، دەنا لە ناخ و ناوەڕۆک و ئامانج و خەیاڵ و خۆزگەکانیەوە، جیاوازیەکی قووڵ و بنەڕەتی بەدی نەدەکرا. چونکە تاڵەبانی و بارزانی هەردوک کوڕی هەمان مێژوون کە ساڵەهای ساڵە مرۆڤی جەنگاوەر وەبەر دێنێت. ئەم جەنگاوەرانە یەک لە دوای یەک دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست و تەنها لە ڕووخساردا لەیەک جیاوازبوون و لە ناوەرۆک و نەستیاندا یەک خۆزگە و مۆتیڤ بزواندوونی. ئاخیان تەنراوە بە خۆزگە و حەزی دەسەلات، حەزی قۆرخکردنی گشت سیمبۆلەکان، ئەو سیمبۆلانەی کە دەسەلاتی ئایین و دەسەلاتی سیاسی لەخۆگرتووە. ئیدی هەرچی دروشم و وتە و ڕەفتاریان هەیە دەمامکن بۆ شاردنەوەی ئەم

ناخە. کوردایەتی لەوێدایە کە بەرژەوەندی ئەوانی تێدا بێ. تا بەرژەوەندی ئەو سەرکردانە لە شاخ و چەکداریدا بوو بێ، ئەوا کوردایەتی لە وێدا بووە. هەرکاتیش بەرژەوەندییەکانیان کەوتە لای حکومەتی ناوەندیەوە، ئەوا کوردایەتیش دەگوێزرێتەوە و هەزار و یەک بڕ وبیانوو بۆ ئەو سیاسەتەیان دێننەوە.

ئا لێرەدا پرسیارێک خۆی قوت دەکاتەوە: ئایا چۆن دەکرێ ئەم سەرکردانە ئەم بیانوو و پاساوانەیان بۆ بچێتە سەر؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دێینەوە لای جەماوەر و ڕووی ڕەخنەمان لەوان دەکەین، وەڵامەکەش ئەوەیە: نەزانی جەماوەری کورد لەوێدایە کە دەرک بەو نەستەی سەرکردەکانیان ناکەن. لەمەش گرنگتر ئەوەیە کە کوردایەتی بۆتە دۆگمایەک، هەرکاتێ دروشم و سیمبول و سروتەکانی ئەو عەقیدەیە بوترێتەوە، ئەوە دەکرێتە گەواهیەک بۆ ڕاستگۆیی ئەو کەسە یان ئەو سەرکردەیە، بێ ئەوەی لە دەرەنجامی کار و کردەوەکانی ئەو سەرکردەیە بکۆڵرێتەوە. هۆی ئەوەش یان نەزانیە

یان زۆربەی ئەو جەماوەرەش هەڵگری هەمان سیفات و کارەکتەری ئەوانن. ئەم دۆخە ناو دەنێین دۆخی بەندبوون لە بەندیخانەی ڕابوردو، کە ناهوشیاری لە خودی لێدەکەوێتەوە. ناهوشیاری لە خود واتە خودشەیدایی و خۆپەرستی.

دیارە سەرکردەکانی کورد لە چاوی جەماوەرەکەیانەوە شۆڕشگێڕن. وەلێ ئێمە گەر بە چاوێکی زانستیانەوە لەم سەرکردانە بڕوانین، هەر لە شێخ عوبێدوللای نەهریەوە، قازی موحەمەد، شێخ مەحمود و مەلا مستەفا، تا دەگاتە تاڵەبانی و بارزانی، ئیمڕۆ کە گشتیان دەکەونە خانەی جەنگاوەرەوە. چونکە شۆڕشگێڕ قۆناغێکی پەرەسەندووی بەرز ترە لە جەنگاوەر. جەنگاوەر بەرهەمی سەردەمی جەنگەڵە و چالاکیەکانی بریتین لە کۆمەڵێک کاردانەوەی سادەو ساکار و کورتبڕ و ئامانجێکی گچکەی وەک نێچیرگرتنێک. شۆڕشگێڕ ئاستێکە مرۆڤ تێیدا دەیەوێت پێویستیە ڕۆحی و دەروونیەکانی وەدی بهێنێت. شۆڕشگێڕ هەڵگری مەعریفە و عیرفانە.

شۆڕشگێڕ هەڵگری ڕق و کین و ئامانجی تاکە کەسی و وەدەستهێنانی مەرامی تایبەتی خۆی نیە. شۆڕشگێڕ هەروەک خەمی خۆی دەخوا، خەمی ئەوتریش دەخوات کە بەرامبەری وەستاوە و داوای مافی لێدەکات. شۆڕشگێڕ مرۆڤدۆست و جیهانبینیەکی فراوانی هەیە. ئامانجەکانی تەنها لە خودی خۆیدا کۆنابێتەوە، بەڵکو لە جۆری خۆشیدا دەیبینێتەوە. تەنها خەمی تاک هەڵناگرێ، بەڵکو خەمی کۆ و مێژووی ئەو مرۆڤانەش هەڵدەگرێت. هەروەک تاکەکانی نەتەوەکەی خۆی فێری ڕەوشت بەرزی ئەکا، هەوڵ ئەدات تاکەکانی ئەوانی دیش فێری ڕەوشتی پێکەوەژیان و مرۆڤدۆستی بکات.

ئەگەر جەنگاوەر بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕێت تا ئەو ساتەی دەگۆڕێت بۆ پاش جەنگاوەری ئەوسا دەشێ بگاتە قۆناغی شۆڕشگێڕی، ئەوا تا هەنووکەش کورد بە سەرکردە و جەماوەریشەوە، قۆناغی جەنگاوەریان تێنەپەڕاندووە. دەشێ تاکی کوردی ڕۆشنبیر هەبن ئەم قۆناغەیان بڕیبێت، وەلێ بەپەنجەی دەست دەژمێرێن و

خاوەنی هیچ دەسەڵاتێکیش نین. ئەگەر تەمەنی نەتەوەی کورد بچوێنین بە تەمەنی مرۆڤێک لە منالْیەوە تا کاملْ بوون، ئەوا کورد هێشتا تەمەنی هەرزەیی نەبڕیوە. کێشەکەش لەوەدا نیە کە نەتەوەیەک هەرزە بێ، بەڵکو لەوەدایە کە ئەو نەتەوەیە خۆی بە کاملْ بزانێ. جگە لەوەش ئەم هەرزەکارە هەتا هەنوکەش لە باوەشی ناسنامەی نەتەوەکانی تردا تەپاوتلی بێت. هێندە بوێر نیە بتوانێ سەربەخۆ و ئازاد بیرکاتەوە و نەتەوەکانی تریش لەوە ئاگادار کاتەوەو بڵێت وا منیش هەرزەکاریم بڕی و کاملْ بووم. ئەوە بدات بە گوێی نەتەوەکانی دی و بڵێ واخۆم بۆ خۆم بیردەکەمەوە و خاوەنی جیهانبینی خۆمم و ژیان و مردنم خۆم بۆخۆمی دیاری دەکەم. گەر کورد بگاتە ئەم ئاستە لە بیرکردنەوەدا، لەگەلْ ئەوانی تردا بە ئاراستەیەکی تردا دەڕوات و ئەوانی دی ناچار دەکات لە کۆتاییدا ملکەچی فەلسەفە و پرۆژەی مرۆڤدۆستی ئەم کوردە کامڵە ببن. وەلێ هەتا هەنووکە ئەو سەرکردانە بەرگر و ڕێگرن لەبەردەم کاملْبوونی ئەم نەتەوە هەرزەیەدا.

کورد لە قۆناغی هەرزەکاریدا گیری خواردوە، شپرزەیە و چاوەڕوانی سەرکردەیەک دەکات لەو قۆناغە ڕزگاریان بکات، تا بتوانن ناسنامەی خۆیان بە دەستی خۆیان پێکبهێننەوە.

دەتوانین لێرەدا بە نموونەیەک باسەکەمان زیاتر ڕوونکەینەوە. دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و خۆدامەزراندنەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان لە پاش شکستی بارزانی، لە بەرامبەر سیاسەتی ڕژێمی ئەو کاتەی عێراق، خاڵی دەستپێکردنیان ئەوە نەبوو ئەم پرسیارە جەوهەریە لە خۆیان بکەن: **هۆی چییە چەندین جار کورد ئەو دەرفەتەی بۆ هەڵکەوت و دەشیا هەلێک بوایە بۆ دامەزراندنی کورد، کەچی کۆتاییەکەی شکستهێنان بوو؟** ئەم پرسیارە گەر مرۆڤ لە خۆی بکات، واتای هوشیاریەکی بەرز دەگەیێنێت. چونکە بە دوای هۆکاری ڕاستەقینەی دیاردەیەکدا دەگرێت و خۆی بە گەمەی کات بەسەربردن خەریک ناکات. گشت ڕێبازێکی مەعریفی لەو پرسیارە جدیەوە سەرهەڵدەدات کە وێڵی هۆکاری یەکەمە.

ئەوان توانای دامەزراندنی ڕێبازێکی فەلسەفی پەروەردەییان نەبوو تا تاکەکانی کوردی پێ هۆشیار بکەنەوە، کە تاکەکانی کورد فێری جیاکاریان لە نێوان ڕەگەزپەرستی و ڕەگەزناسیدا پێبکەن، تا تاکەکانی کورد فێری نیشتمان پەروەری و هاونشتمانیەتێکی ڕەوشت بەرز بکەن، ئەوە نەبوو تاکەکانی کورد فێری ئەوە بکەن کە بەرژەوەندی باڵا بخەنە پێش بەرژەوەندی تاکەکەسی تا ببنە جێگا سەرنجی تورک و عەرەب و فارس. لێرەدا مەبەستم دانانی وەزارەتی پەروەردەو مافی مرۆڤ نیە، بەڵکو ڕێکخستنی بزاڤێکی شۆرشگێرانەی ئازادگەری و عیرفانیە، لەبری وتنەوەی دروشم و لێدانی دەهۆڵی ئاڵاو خاک و جوگرافیا. بە پێچەوانەوە هەردوو پارتەکە پێشبڕکیان بوو لەسەر ئەوەی لە چ وڵاتێک کۆمەکی ماددی و چەک وەدەست بهێنن، لەکاتێکدا پێش ئەوەی ئەو چەکە دژی ڕژێمی بەغدا بەکارهێنرابێت، دژی یەکتر بەکاریان هێناوە. چونکە ئایدۆلۆژیای جەنگاوەر لەسەر ئەوە بەندە کێ لە ڕووی ماددی و چەکەوە خاوەن بازوویەکی ئەستووربووە، ئەوە

سەروەری وەدەست دینێ و دەبێتە دەسەڵاتدار. ئامانجی گەورەی جەنگاوەران ئەوەیە چۆن بگەنە لوتکەی هەرەمی دەسەڵات. تەنها ئەو شوێنە دەیانحەوێنێتەوە، بۆیە ئامادەن پەلاماری گشت شتێکی نامەشروع بدەن و لە پێناوی مانەوە لەو لوتکەیەدا هەموو جۆرە سیمبۆل و دروشمێکی نەتەوەیی و ئاینی و سیاسی بخەنە کار بۆسڕکردنی جەماوەر،بێ ئەوەی ویژدانیان تۆزقالێک خورپەی پێدا بێت و ئاورێک لە ڕەهەندی ڕۆحی مرۆڤی کورد بدەنەوە. لەگەڵ ڕێزمدا بۆ مرۆڤی جەنگەڵ کە ئەوان لەو سەردەم و شوێنەدا جەنگاوەری مانەوەی پێبەخشیون. وەلێ گوێزانەوەی سیفاتی جەنگاوەر بۆ شار، هەمیشە دەبێتە خولقێنەری شپرزەیی بۆ خود و بۆ ئەویدیش. لەم کەشە گرژو ئاڵۆزەدا مرۆڤ نایپەرژێتە سەر مافە ڕوحی و مرۆییەکان و پرسیارە جەوهەرییەکانی ژیان.

ئەم جەنگاوەرانە هەمیشە ئەو هەلانە دەقۆزنەوە کە بەرژەوەندی تاکەکەسی خۆیان دابین بکەن. هەرگیز دووربینانە لە بەرژەوەندی باڵای نەتەوەکەیان ناڕوانن. بۆ نموونە لە جەنگی ئێران و

عێراقدا پارتە کوردیەکان بە تایبەتی پارتی و یەکێتی بوونە ئۆپۆزسیۆن لە ناو ئێراندا. گەر ئۆپۆزسیۆنێکی ئاسایی بوونایە قەیدی نەبوو، بەڵام ئەوان بە تۆپەکانی ئێران بۆردومانی شاروشارۆچکەکانی کوردستان بکەن تا بڵێی جێگەی لۆمە و ڕەخنە و گلەیی و گازندەیە. ئەویش لەبەر سێ هۆ :

**یەکەمیان؛** کە زۆر گرنگە، ئەوەیە کە کێشەی ڕەوای نەتەوەیەک تێکەڵ بە کێشەو جەنگی نێوان دوو دەوڵەتی بێویژدان دەکەن. ئەم کارەیان زیانێکی مەزنی بە ڕەوتی سیاسی و چارەنوسی کورد گەیاند. مرۆڤی دڵسۆز و ڕاستگۆ بە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە ئامانجی سەرەکی پرۆژەکەی لە گشت خەوش و کەلێنێک بپارێزێت و بەبەردەوام مافی سروشتی خۆی بە جوانترین شێوە و شێواز بۆ دۆست و دوژمن بخاتە ڕوو. ونکردنی ئەو ئامانجە سەرەکیە زەبرێکی مەزنە بە رۆحی نەتەوەی کورد گەشتووە.

**دووەمیان؛** بیانوویەکی زۆر دیار و ئاشکرا بوو بە ڕژێمی عێراق بەخشرا، تا بە بێ شەرم و ترس لەبەر

چاوی هەموو جیهان و جیهانی عەرەبیش دەست لە کورد نەپارێزێ و کاری ناڕەوای ئەنفال و کیمیایی جێبەجێ بکات. گەر من لە ڕۆحی ئەم جەنگاوەرانە تێگەشتبم، زۆر خۆشحاڵ بوون بەو کارەساتە، چونکە پشتیوانیان بۆ خۆیان زیاد دەکرد. وەلی شۆرشگێر کارەسات لەمرۆڤ دووردەخاتەوەو خۆشگوزەرانییان بۆ دابین دەکات.

**سێیەمیان**؛ ئەوەیە، ئەو ڕەوتە سیاسیەی سەرکردەکانی کورد گرتویانەتە بەر هەمیشە وای لێکەوتۆتەوە کە گەلی کورد بەسەر دوو سیستەمی جاشایەتی و پێشمەرگایەتیدا دابەش بێت و جەستەی کورد بە هۆی ئەم سیستەمەوە خۆی خۆی بخوات، وەک چۆن مۆزرانە جەوال هەڵدەوەشێنێت. سەیر لەوەشدایە هەمیشە ژمارەی جاش لە پێشمەرگە زۆر زیاتر بووە. ئەم دابەشبوونە کەلتورێکی تا بڵێی سەیرە و مێشک و دەروونی گشت کوردێکی تەنیوەتەوە. وەک عەقیدەیەکی لێهاتووە کە هەرچی سیفاتی جوان هەیە پێشمەرگە هەڵگریەتی و هەرچی سیفاتی ناشرینە جاش هەڵگریەتی. زۆر سەیرتر لەوەش ئەوەیە کە ئەم

دوو گرووپــه ئەوەنــدە لــە خــاڵی لاوازی یــەكتری شارەزان، تا ئێستەش جاش لە ناوناتۆری جاشایەتی خۆی شەرم نایگرێ. چونكە ئەوە لای ئەو روونە كـە ئەوەی بـەناوی پێشمەرگەوە دەدوێ، زۆر لـە خـۆی دەچـێت، ئیدی شـەرم لـە چـی بكـات! ئـەم سیـستمە هــەروەك سیـستەمی كــافر و موسـولمانەكەی نـاو كـــەلتوری موســـولمانەكان لـــێهاتووە. موســـلمان هەرچـۆن بـێ هــەر جوانــە و دەچـێتە بەهەشـتەوە، پێـشمەرگەش هەرچــۆن بــێت هەرجوانــەو شــەهید دەبـێت. جــاش و كــافر ئـەو دوو مرۆڤـە ناشــرینەن هــەرگیز جـوان نـابن و خاوێـن نابنـەوە. نـاڕەوایی سیستەمێكی لەم جۆرە بۆ ئەم سەردەمە لەوەوە دێ كـە ئـەم سـەردەمەی ئێمە ئـەم جـۆرە دوالیزمانــە هەڵدەوەشێنێتەوە و دیالەكتیك لە جێگەی دادەنـێ. واتە لە نێوان شتەكان و دیاردەكاندا كارلەیەككردن هەیــە، ئـــەم هۆكـــاری دروســـتبوونی ئـــەویترە، ئـەویتریش هۆكـاری دروسـتبوونی ئـەمی تـرە. بـەم بۆچـــونە موســـڵمان، كـــافر دروســـت دەكـــات و پێـــــشمەرگەش جـــــاش دروســـــت دەكـــــات، بەپێچەوانەشەوە هەر ڕاستە.

تێکەڵکردنی ڕەوتی سیاسی کورد بە جەنگی ئێران و عێراق، دۆزی کوردی لە چاو گشت عەرەبێکدا- ئەمە لە کاتێکدا جێی شەرمە کە کورد لە لایەکی ترەوە هەر خۆی فرێدەداتە باوەشی عەرەبەوە- کردە خیانەت بە نیشتمان. مرۆڤ هەرچەندە نەشاز و دڕندە بێت گەر بیانوویەک یا ساختەش بێ بۆ دڕندایەتیەکەی نەدۆزێتەوە، ناتوانێ وا بە ئاسانی ئەو دڕندایەتیە ئەنجام بدات (بە تایبەتی کەنەتەوە سەردەستەکانی دەوروبەرەکەشی هەق نەناس و نەزان بن). جگە لەوەش تۆ وەک ماف خوراو، دەبێ کاراکتەری بەرامبەرەکەت باش بناسی و حسابی بۆ بکەیت، هەر بۆیە زۆر جاریش قوربانی وەک دەروونناسان دەڵێن خۆی بەشدارە لە دروستکردنی ئەو بیانوەی کە دەیدا بەدەست جەللادەکەیەوە، بەتایبەتی ئەگەر قوربانیەکە ناهۆشیار بێ.

لەو بارودۆخەدا کە جەللاد و قوربانی تێکەڵ دەبن، جەللاد خۆی بە قوربانی دەزانی و قوربانی وەک جەللاد دەخرێتە پێش چاوی جیهان، بە تایبەتی جیهانی عەرەب. ئەم دیاردەیەمان بەتایبەتی لە پرۆسەی دادگاییکردنی سەددام و دار و

دەستەکەیدا بینیەوە. لەو دادگایەدا بە ئاشکرا ئەوەمان دەدی کە چۆن ئەوان واتە جەللادەکان بەرگریان لەخۆیان دەکرد، بەوەی دژ بە ئێران جەنگاون و هەوڵی ئەوەیانداوە کە نیازە خراپەکانی ئێران سەبارەت بە ناوچەکە، پوچەڵ بکەنەوە. وا پاساویان دەهێنایەوە کە ئەوان بەرگریان لە عێراق کردوە، نەک دژ بە کورد جەنگا بن. ئەوان لە خەیاڵێکدا بوون کە کورد و فارس- بە هۆی مێژوو و ڕەگ و ڕیشەی هاوبەشیان- بوونەتە بەرەیەک دژ بە عێراقی خاوەن مێژووی عەرەبی و ئیسلامی. خۆیان وەک قوربانی دەخستەڕوو نەک شانازی بەوەوە بکەن کە ئەوان جەللاد بوبێتن.

ئیتر دۆزی نەتەوەی کورد لەم کەین و بەینەدا لە کوێدا باس و خواسی هەیە؟! کێ لەم لێنگەوقوچکردنە بەرپرسە. لێرەدا بازنەیەکی خولگەیی دێتە کایەوە کە بە هیچ شێوەیەک ناتوانی قوربانی لە جەللاد جیا کەیتەوە، بەڵکو خاوەن دەسەڵات بە ویستی خۆی جەللاد و قوربانی دیاری دەکات. تا بەعس دەسەڵاتدار بوو، ئەوا خۆی وەک قوربانی و کوردیشی وەک جەللاد نیشان دەدا.

بەلام هەنووکە قوربانیەکانی ئەمڕۆ -جەللادەکانی دوێنێ بە بۆچونی ڕژێمی بەعس- کە دەسەلاتیان بە دەستەوەیە، قوربانیەکانی دوێنێ -بە بۆچونی ڕژێمی بەعس- ئیمڕۆ دەکرێنەوە بە جەللاد و سزای خۆیان وەردەگرن. لەم سەروبەندەدا دۆزی ڕەوای کورد کە کێشە جەوهەریەکەیە، لە نێوان کێ قوربانیە و کێ جەللادە، لە نێوان تۆڵە و تۆڵەسەندنەوە و چەندین کێشەی تر، ونبووە. ئەو کێشە جەوهەریە ئەوەیە کە کورد نەتەوەیەکی سەربەخۆیە و مافی خۆیەتی وەک گشت نەتەوەکانی دی چارەنوسی خۆی، خۆی دیاری بکات. کێشەی حەزی دەسەلات گرتنەدەست لە لای سەرکردەی پارتە کوردییەکان، بە تەواوی بۆتە ئامانجێکی سەرەکی وئامانجە سەرەکیە ڕاستەقینەکە کە سەربەخۆیی ڕۆحی و مادی نەتەوەی کوردە کەنارخراوە.

هەرچەنیش جەماوەری کورد بە ئامانجە سەرەکیە مەزنەکە دنەدراوە، بەلام کۆتاییەکەی هەتا هەنووکەش ئەوە دەرنەچوە کە چاوەڕوانکراوە. هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ

ئەوەی هۆکانی وەدیهێنانی ئەو ئامانجە مەزنە بە بەردەوام لەگەڵ ڕوحی ئامانجەکەدا نەگونجاوە. کورد دەبێ بۆ ئەم ئامانجە مرۆییە ململانێیەکی مەعریفی و فەلسەفی و ڕەوشتی لەبەرامبەر نەتەوە سەردەستەکانیدا بورووژێنێت. نەک بە سیاسەتی ڕووت و خەباتکردن بە چەکی فارس دژ بە عەرەب، بە چەکی عەرەب دژ بە تورک و بە چەکی عەرەب دژی فارس، فوو بە بزاڤی نەتەوایەتی کورددا بکات. ئەم ڕەوتە سیاسیە ستەمێکی مەزنە لە کورد کراوە و ڕەنگە جارێکیدیش بکرێتەوە.

هەمیشە وتومە کورد دەبوایە وانەیەکی باش لە جولەکەوە فێربوایە. جولەکە بۆ بەرگری لە مافەکانی خۆی وەک مرۆڤ، فەلسەفە و مەعریفەیەکی قوڵی خولقاند کە زۆرێک لە ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوا لە ژێر کاریگەری ئەواندا بیریان دەکردەوە. جولەکەیەکی بێ خاک چۆن توانی قەوارە و دەوڵەت بۆ خۆی بنیات بنێ، کەچی کورد لەسەر خاکی خۆی ئەوەی پێناکرێ و بگرە ڕۆژ بە ڕۆژیش سنوری خاکی تەسکتر دەبێتەوە. کورد دەبێ لەو ئایدۆلۆژیایە خۆی ڕزگار بکات کە

چەک و شاخ پاڵپشتیەتی. چەک و شاخ بووەتە ئایدۆلۆژیایەک تا ئێستەش  بە شێوەیە لە شێوەکان لەنەستی کوردا هەر بەردەوامە. هەرچەندە ئێستا لە باشووری کوردستاندا بەهۆی سیاسەتی نێودەوڵەتیەوە هەلێک بۆ کوردی باشوور هەڵکەوتووە کە ببێتە هۆی کپکردنەوەی ئەو ئایدۆلۆژیایە، بەلام لە ڕاستیدا ئەو ئایدۆلۆژیایە پێکهاتەیەکی دەروونی ئەوتۆیە تا هەنووکەش لە نەستی نەتەوەی کورد و سەرکردەکانیدا کاری خۆی دەکات. جگە لەوەش شانازیکردن بە چەک و شاخ کە گوایە بۆتە هۆی ڕەخسانی ئەو هەلە، ڕۆژانە تا ئێستاش گوێبیستی دەبین. ئەوەش شتێکی ئاساییە، چونکە ئەلتەرناتیڤی ململانێی سیاسی و چەک کە ململانێیەکی مەعریفی و فەلسەفی و ڕەوشتیە، هێشتا لە ئەقڵیەتی کوردا، دروست نەبوە و پەرەی نەسەندوە.

سیاسەتی چەوتی کورد بەرامبەر دڕندەیەکی وەک ڕژێمی بەعس چەندین ئاکامی سەختی لێکەوتۆتەوەو تا ئێستەش ئاسەوارەکانی هەر ماون

و کورد پێوەی دەتلێتەوە. کارەساتەکەش لەوێدایە
کە کورد خۆشی بەشدارییەکی ڕاستەوخۆی لەو
تراژیدیایەدا هەبووە. هەروەک چۆن ڕژێمی بەعس
داخی خۆی بە کورد لەبەر ئەو هۆیانەی کە پێشتر
باسمانکرد دەڕشت، ئاوەهاش ئەو کوردانەی کە لە
خانەی جاشێتیدا بوون داخی خۆیان بەوانە دەڕشت
کە لە خانەی پێشمەرگایەتیدا بوون. ئەویش بە هۆی
ئەو دابەشبونە خێلەکی و عەشیرەتگەرابیەوە بووە
کە کورد خۆی لە پێش هەموو کەسێکەوە لێی
بەرپرسە. تراژیدیای ئەنفال و کیمیاباران ئاکامی
ململانێی دوژمنکارانەی نێوان کورد و عەرەب نیە
بە تەنها، بەڵکو ململانێ و کێشەی نێوان خێڵە
کوردیەکانیش ڕۆڵی گرنگی تێدا بینیوە. لەم
نێوەندەدا جەستە و ڕۆحی نەتەوەیەکە پارچە
پارچە ئەبێ و لە ناخەوە خۆی ئەخواتەوە. جگە
لەوەی کە بە ناڕاستەوخۆش بە هۆی سیاسەتی
کورتبینی و چەوت و هەڵپڕوزاوی سەرکردە و
پارتەکان سەبارەت بە سەرسەخترین دوژمن، هەر
بەشێک لە بەرپرسیارێتی مێژووی خۆی هەڵدەگرێ.
بۆیە لەوێدا نازانین چۆن کورد ناوبنێین قوربانی

کە زۆرینەی چەکدارەکانی کوردی باشور لە خانەی جەللادی عەرەبیدا دەبینرینەوەو، کەمینەی چەکدار کوردی باشووریش لە خانەی جەللادی فارسیدا دەبینرینەوە. دەنا چۆن و لە چ لۆژیک و فەرهەنگێکدا دەگونجێ کە دوژمنی کوردی عێراق ببێتە دۆستی کوردی ئێران و هەروەها بە پێچەوانەشەوە. ئەوەی قوربانی ڕاستەقینەیە ئەو توێژ و چینەیە کە لەم کەین وبەینە ناگات و بە ماڵ و بەگیان دوای دروشم و سیاسەتی بێ سەروبەری ئەم پارتانە دەکەون و بەرهەمی قوربانی بوونەکەیان، دەسەڵاتدارەکان دەیچننەوە.

پاش کۆتایی جەنگی ئێران و عێراق و پاش تراژیدیای ئەنفال و کیمیاباران، چەکدارانی خانەی پێشمەرگە گەشتنە ئەوپەڕی بێ ئومێدی و شکستی و بێ دەسەلاتی. دۆزی کورد هێندە تێکەڵی بەرژەوەندییە ناکۆکەکانی نێوان ئێران و عێراق بووبوو، هیچ نرخ و بەهایەکی تێدا نەما بوو، تا قسە و باسی لەسەر بکرێ. دەرئەنجامی دروونەوەی سیاسەتی چەوتی سەرکردەکانی کورد، سەربەخۆیی

و ئـــازادی نـــەبوو. بـــەڵکو تراژیـــدیای ئـــەنفال و کیمیاباران و ڕەهێڵەی بێ ئومێدی و شکستی بوو.

هـێندەی نەخایانـد، جـەنگی کەنـداو بـەرپا بـوو، بـووە هـۆی شکـستی حکومـەتی ناوەنـدی بەرامبـەر هێزی نێودەوڵەتی و لاوازبوونی دەسەڵاتی بەعس لە باشـووری کوردسـتان. ئـەم ڕووداوە ئومـێدێکی بـە کورد بەخـشیەوە و هـەلێکی ڕەخـساند کـە ڕاپـەڕین ئـەنجام بـدەن و زۆربـەی ناوچـەکانی کوردســتان کەوتە دەرەوەی دەسەڵاتی بـەعس. ئـەم ڕاپەرینـەش هـێندەی نەخایانـد نائومـێدیەکی تـری لـێکەوتەوە و تراژیدیایەکی تری لێوەدەست هات، ئەویش کۆڕەوە سێ ملیۆنیەکە بوو. دیسانەوە ئاکام و بەرهـەمی ئەو ڕاپەرینە لە بری ئازادی و ولاتێکی سەربەخۆ و پتەو بێ، کەچی کۆڕەو و براکوژی نـێوان پارتـەکان بـوو. ململانـێی و هەڵپـەکردن بـۆ دەســەڵات بـە تایبـەتی پارتی و یەکێتی، ئەو دورشمانـەی کـە چـەندین سـاڵ وەک سیمبۆلـێک دەوترانـەوە، لـە چـەند ساتـێکی کورتـدا وەک بلقـی ســەرئاو تەقینــەوە. هەرچـی پارتـەکانی تریش هــەبوون بـە ناچـاری سەرچاوەی

پارە و دەسەڵات لە کوێدا بوایە ڕووگەیان بۆ ئەوێ وەردەچەرخان. دەرئەنجامەکانیش بریتی بوون لە شەڕی ناوخۆی زۆربەی لایەنەکان و ڕێکەوتنەوە لەگەڵ حکومەتی ناوەندی لە پێناوی دەرپەڕاندنی ئەوی تر و ئاوارەبونەوە و پارچە پارچەکردنی ئەو بەشە خاکەش کە بە هۆی ڕاچڵەکینی جەماوەریەوە کەوتبووە ژێردەستی کورد و دروستکردنی دوو ناوچەی بەڕێوەبەرایەتی و فەرهودکردن و دابەشکردنی سەروەت و سامانی نیشتمان. گەندەڵی بەڕێوەربردن و کۆمەڵایەتی و ئابوریش جەستەی ئەم بەشەی باشوری بە تەواوی نەخۆش خست و لە بری دە هەنگاو بۆ پێشەوە دەیان هەنگاو بۆ دواوەی بردنیەوە. گەر بەرژەوەندیەکی باڵاو و ڕەوشتێک و کەلتورێکی لەیەکگەیشتن و خودڕەخنەیی نەبێ، ئەوا هەموو دژی هەموو دەجەنگێت و شیرازەی هەموو بوارەکان لەیەک دەترازێن و هەرکەس بۆ بەژەوەندی خۆی لە تاک و لە کۆمەڵ هەڵپەو پەلەقاژە، دەبێتە خووی.

ئەمانە هەمووی -بە هۆی سیاسەتی نێودەوڵەتی و بوونی ئەمەریکا لە عێراق- تێپەڕدەبن و لێرە و لەوێ هەندێ ئاو بەسەر ئاگرەکاندا دەکرێ و چارەسەریەکی ڕووکەش و وەختی بۆ گرفتەکان دەکرێ و هەموو لایە تەسلیم بە ئەمری واقعی دیموکراسیەت دەبن و ڕووی خۆیانی پێ بۆیاخ دەکەن. دوای قەیرانی دابەشکردنی کوردستانی گەورە لە مێژوویەکی دووردا بەسەر چوار بەشدا، قەیرانی دابەشکردنی کوردستانی بچوک بەسەر سێ بەشدا دێت و دوای ئەوەش دابەشکردنی دەسەڵات لە لایەن سەرکردایەتی پارتی و یەکێتیەوە بۆ سەرۆکی هەرێم و سەرۆکی کۆمار و لاوازی گوتاری کوردی لە ئاستی سوننە و شیعەدا، دیسانەوە قەیرانێکی تریان خوڵقاند. کە دەڵێم لاوازی مەبەستم لاوازی قسەکردن نیە دەنا زوو زوو لێرە و لەوێ هەڕەشە و گوڕەشە بە با دەدرێت، بەڵکو مەبەستم لاوازی مەعریفی و ڕوحی و پرۆژەی نەتەوەییە کە زۆرجار وا لە کورد دەکات لە ئاست نەتەوەکانی تردا هەستی خۆ بەکەم زانینی تێدا دەرکەوێ.

سیاسەتی کورد هەتا هەنووکەش هەر بەو ئاراستە چەوتەدا دەڕوات کە چارەکە سەدەیە لەمەوبەر پێیدا دەڕۆیشت. ڕەنگە هەمان ئەزموونی شێخ مەحمود لە بەرزانی دووبارە بێتەوە. کە ئینگلیز شێخ مەحمود دەکاتە مەلیکی کوردستان، کەچی بەرژەوەندی شێخ وا سەروبن دەبێ کە بچێتەوە بە گژ ئینگلیزدا. بەرزانیش بە هۆی دەستێوەردانی ئەمریکاوە دەبێتە سەرۆکی هەرێمی کوردستانی باشوور، بەڵام هەرکە دەسەڵاتی ناوەندی خۆی گرت و چەسپاو وا ڕێکەوت کە بەرژەوەندی بەرزانی و حکومەتی ناوەندی بەرەوڕووی یەکدی بوونەوە - ئیتر بەرژەوەندیەکە هەرچیەک بێ، دارایی یان دەسەڵات یان هەر گرفتێکی تر بێ - ئەمیش دیسانەوە بەرگی بەرژەوەندی نەتەوەیی بە بەردا دەکات و لە ژێر باری حکومەتی ناوەندی دەردەچێت و دژ بە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دەوەستێتەوە ـ هەروەک چۆن شێخ لەگەڵ تورکیا پێکهاتەوە ـ بۆیە دەشێ بارزانیش لەگەڵ ئێران پێکبێتەوە. ئەمەش ناکرێ ناوی پڕۆژەی نەتەوەیی

لێبنێین بەڵکو ناوی پرۆژەی دەسەلاتی تاکێک یان پارتێکی لێ دەنرێ.

لەگەڵ ئەو ڕاستیەشدا کە بە تەنها گەمەی سیاسی دادی مەسەلەی نەتەوەی کوردی نەداوە و ناشیدات، بەڵکو وەک لە پێشەوەش ئاماژەم پێدا ململانێیەکی مەعریفی ڕوحی دەبێ لە پشت ئەو سیاسەتەوە بێ. کەچی نەشیتوانیوە گەمەی سیاسی لەم چارەکە سەدەیەدا بە ئاراستەی خۆیدا بەرێت و تیایدا کارابێت. بە درێژایی مێژوو ئەم مەسەلە نەتەوەییە لە پێناوی دەسکەوتنی دەسەلاتی ئەم سەرکردەو ئەو سەرکردەدا هەر کێشمەکێشی پێدەکرێت، واتە بەرژەوەندی خۆیانی تێدا بەدی دەکەن، ئەوەندە هەیە ئەو بەرژەوەندییە بە سیمبۆلی نەتەوەیی و شۆرشگێری چوارچێوەیەکی تێدەگرن و دەهۆڵی بۆ لێدەدەن، تا ئەو کاتەی هەست بە مەترسی لەدەستدانی دەسەلاتی خۆیان دەکەن، جا گەر سەرچاوەی ئەو مەترسییە لە ناوخۆی کوردەوە بێت، ئەوا یان پیلانێکی بۆ دەگێڕن یان بە ئاشکرا بە گژیدا دەچن، زۆر دووریش نیە پەنا بەرنەوە بەر

دەســـــەلاتی ناوەنـــدی یـــان هـــــەر بـــێگانەیەکی تـــر.هـــەروەک لەســـالی ١٩٩٦دا بینیمـــان کەچـــۆن هەردوو پارتە سەرەکیە بەشەڕهاتوەکەی باشووری کوردستان بۆ مانەوەی دەسەلاتی خۆیان پەنایان بۆ هـــەردوو حکومـــەتی عێراقـــی وئێـــرانی بـــرد. ئەگـــەر سەرچاوەی مەترسیەکەش لە دەسەلاتی ناوەندەوە بـــێت ئـــەوا ئـــالای شۆڕشـــکردن بـــە بارێـــکی تـــردا هەڵدەکـــەن و شـــپرزەکردنی کۆمـــەڵگا نـــاو دەنـــێن شـــۆڕش و زیـــان دەکـــەن بـــە قـــازانج و چـــوونە بـــن دەســـتی عـــەرەب و فـــارس و تـــورک نـــاو دەنـــێن پێشمەرگایەتی.

**سەرەڕای ئەو قوربانیـــەی کـــورد داویـــەتی و ئـــەو خەباتەی کردویەتی لە پێناو مافی ڕەوای خۆی، لای من هەر ئەوە دەمێنێتەوە کە ئەو ئاراستە سیاسـیـەی کورد وەک گوێزی پوچ بێ کاکڵە بووە. ئەویش لەبەر نەبونی ناوەڕۆک و جەوهەرێکی فەلسەفی، مەعریفی ئـــەخلاقی لـــە پـــشت ئـــەو خـــەبات و سیاســـەت و جەنگکردنەوە.**

تا ئێستە قسەمان لەسەر ڕەوتی سیاسی ئەو گروپانە کرد کە باسی ڕەهەندی نەتەوایەتی دەکەن و گوتاری خۆیان بەو ئاراستەیەدا پێشکەش دەکەن. ئەوەشمان ئاماژە پێدا کە لە هەمو بارێکدا هێشتا نەبووەتە خاوەنی فەلسەفەیەکی ڕوحی و جیهانبینی تایبەت بە خۆی، بۆیە هەر هەوڵێک دەدات دەرئەنجامەکەی شکست هێنان یان دەسکەوتێکی زۆر لاوازە کە لەئاستی سەختی بە قوربانیبوونیدا نیە. **ئاخۆ کورد خۆی دەستی نەبێت لە قوربانیبوونی خۆیدا؟ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێت لە قوربانناسی (victimology) وەرگرینەوە.**

## نەتەوەی کورد و قوربانناسی

هەر تاکێکی کورد ئاگاداری مێژووی خۆی بێت، ئەو هەستەی لادروست بووە کە خۆی بە قوربانی و ژێردەستە و ستەملێکراو بزانێت. ئەم هەستە ئەوە لە دوای ئەوە بۆ تاکەکانی کورد دەگوێزرێتەوە. ئەم هەستی قوربانیبوونە لە ناخی تاکەکانی کورددا، لە نەستەکۆی جەماوەری کوردا درێژە بە

هەستی خۆبەکەم زانین دەدات. مەترسی بەردەوام بوونی ئەم هەستە لەوەدایە کە ببێتە بەربەستێک لە گەشەکردنی دۆخی سایکۆلۆژی کورد و نەتەوەی کورد لە قۆناغی هەرزەکاریدا گیربخوات و دەرنجامەکەشی مانەوەی بێت بە ژێردەستی. بۆ کردنەوەی گرێی هەستی قوربانیبوون و ڕێکردنەوە بۆ گەشەکردنێکی باشی سایکۆلۆژی جەماوەری کورد، گرنگە لە ڕووی زانستیەوە لە قوربانناسی بکۆڵینەوە و پاشانیش لەو ڕوانگەیەوە دۆخی سایکۆلۆژی سیاسیانەی کورد بخوێنینەوە.

لە هەمووومان ئاشکرایە کە نەتەوەی کورد یەکێکە لەو نەتەوانەی کارەساتی زۆری بەسەردا هاتووە و ماڵوێرانی زۆری دیوەو بووەتە قوربانی سیاسەتی ناوچەکە. ئەگەر ئیمڕۆ بمانەوێ مێژوویەکی دووروودرێژی قوربانی گەلێکی وەکو کورد بگێڕینەوە، ئەوا کاتێکی زۆر و گفتگۆیەکی دورودرێژ و لێکۆلینەوەی تایبەتی دەخوازێ. بۆیە لەم بابەتەدا خۆمان وا بەستەی کوردی باشوور دەکەین و وەک مشتێک نموونەی خەروارێک بۆ قوربانیبوون بەکاریدەهێنین. لەوێشدا ڕەوتی

سیاسی ڕێبازێکی تایبەتی کە ڕێبازی نەتەوایەتیە بۆ پارێزگاری لەو قوربانیە، بەرامبەر ڕژێمی بەعس وەک جەللادێک کە چ کاردانەوەیەکی دڕندانەی نواندوە، دەخەینە ڕوو. لە هەمانکاتدا ئاماژە بەو ململانێ سیاسیەی ناوچەکە وەک کۆنتێکستێک کە کوردی تێدا ژیاوە، دەدەین.

دەرئەنجامی خەباتی کورد لە پێناو ئازادی و سەربەخۆیی، قوربانی زۆری لێکەوتۆتەوە. وەلێ ئەم ڕاستیانە چەند پرسیارێک دەوروژێنێ. **ئایا کورد ئەو ڕێبازە سیاسیەی کە گرتوتیەبەر بۆ ئەو دەوروبەرەی کە تێیدا دەژی، گونجاو بووە؟ ئایا کورد تێکستێکی وای لەو کۆنتێکستەدا نوسیوە کە مانابەخش بێت بۆ ئەو ژینگەیەی کە کورد داوای مافی خۆی تێدا دەکات؟ ئایا کورد تا چ ئاستێک توانیویەتی وا لە مافخۆرەکەی بکات دان بەو شێوازی تێکۆشانەیدا بنێ ؟ ئایا ئەو قوربانیەی کە کورد لەو پێناوەدا داویەتی، لە ئاستی ئەو ئامانجەیە کە کوردی باشوور لەمڕۆدا پێیگەیشتوە؟**

**ئایا دەکرا کورد بە کەمتر قوربانی، ئامانجێکی باشتری بهێنایەتە دی؟**

بۆ ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە، سەرەتا پێویستمان بەوە هەیە، چەند پرسیارێکی تر بوروژێنین و بپرسین ئایا قوربانی لە ڕووی زانستیەوە کێیە و چیە؟ جەللاد کێیە؟ پەیوەندی نێوان ئەم دووانە چۆنە، ئایا زانست دەتوانێ یارمەتی قوربانی بدات بۆ ئەوەی جارێکی تر نەبێتەوە بە قوربانی؟ ئایا زانست دەتوانێ ئاراستەی سیاسەتێکی چەوت بەرەو سیاسەتێکی دروست بگۆڕێ؟ ئایا باکگراوەندی زانستی کاریگەرە لەسەر ئاراستەی کاری سیاسی؟

**قوربانناسی چیە؟**

قوربانناسی ئەو زانستەیە کە لە بارو و دۆخ و ڕۆڵی قوربانیەکە لەپێش ڕوودانی بە قوربانیبوونیدا، دەکۆڵێتەوە، تا لەوە تێبگات خودی قوربانی لە قوربانیبوونی خۆیدا چ ڕۆڵێکی گێڕاوە. ئەگەر وایە ئەو ڕۆڵە تاچ ڕادەیەک کاریگەرە؟ چونکە ئەم زانستە پێی وایە کە قوربانیبوون هەروا

ڕوداوێکی هەڵکەوت و سادە و هەڕەمەکی نیە، هەروا لە خۆڕا ڕوودەدات. دەشێ قوربانیەکەش هەڵگری چەند کاراکتەرێکی سەرنجڕاکێش بێت و جەللاددەکە بەرەولای خۆی کێشکات و ڕوداوی قوربانیبوونەکەش سازکات. ئەم زانستە لەو باوەڕەدایە کە زۆربەی جار ئاشنایەتیێک یان جۆرێک لە پەیوەندی لە نێوان قوربانی و جەللادا بەدی دەکرێت. بۆیە ئەم زانستە بۆ تێگەیشتن لە قوربانیبوونی هەر قوربانییەک، بەلایەوە گرنگە سەرەتا لە پەیوەندی و ئاشنایەتی نێوان قوربانی وجەللاد، بکۆڵێتەوە. لە هەمانکاتدا ئەم زانستە هەوڵی ئەوە ئەدات ئەو هۆکارانە بناسێتەوە کە قوربانی دەخوڵقێنن. چونکە تێگەیشتن لەو پەیوەندیە و ناسینەوەی هۆکارەکانی قوربانیبوون، بەرچاو ڕوونیەک بۆ مرۆڤ دروست دەکات، تا بتوانێ دیاردەی ئەو قوربانیبوونە کەمکاتەوە.[1]

پرسەکەی ئێمەش لێرەدا ئەوەیە ئاخۆ نەتەوەی کورد هەڵگری چ کاراکتەرێک بێت وا لە مێژووی تەمەنیدا چەند جارەو دوبارە دەبێتە قوربانی. ئەمەش مانای ئەوە نیە کە هۆکاری دەرەکی و

مێژوویی ڕەتبکەینەوە. وەلێ ئەگەر زانستیانە لەم قەیرانە مێژووییە گەورەیەی کورد بکۆڵینەوە ئەوا ناکرێ لایەنی چۆنیەتی بیرکردنەوە و کاراکتەری کورد پشتگوێ بخرێ. بۆیە بە بۆچوونی من هۆکارەکانی بەقوربانیبوونی کورد لەم چارەکە سەدەیەدا لە م خاڵانەی خوارەوەدا کۆدەبنەوە:

١. **جیۆپۆلیتیک**: (شاخ، ململانێی عێراق و ئێران)

لەڕووی جوگرافیاوە کورد لە نێوان چەند وڵاتێکدا بەشکراوە و لەسەر سنووری ئەو وڵاتانە بۆ داوای مافەکانی خۆی، چەندین جار خۆی جەنگی هەڵگیرساندووە و بەجەنگی وڵاتانی دراوسێش تێکەڵ بووە. کورد نەتەوەیەکی سەرنج ڕاکێش بووە بۆ جەللادەکەی چونکە هەمیشە بەوە ناسراوە کە بە پاڵپشتی دوژمن دژ بە حکومەتی خۆی دەجەنگێت. جگە لەوەی کە وڵاتە دراوسێکان هەمیشە دانیان بۆ کورد ڕۆکردووە کە گوایە یارمەتی دەدەن تا مافی خۆی وەرگرێت. نمونەشمان بۆ ئەم دیاردەیە جەنگی ئازاری ١٩٧٥ نێوان بارزانی و حکومەتی ناوەندی بوو. سەختی و

بەرزی شاخەکانیش دانێکی سروشتی تر بووە کە بۆ کورد ڕۆکراوە، تا بتوانی لە ویدا خۆی پەنابدات. ئەم دوو فاکتەرە واتە دانی سیاسی و دانی سروشتی وای لە کورد کردووە زۆر عەقڵ بە کارنەهێنێت. لە بری جەنگ و ململانێی خوێناوی کە کۆتاییەکەشی هەمیشە و تا هەنوکەش بە شکستی کورد کۆتایی هاتوون، هەوڵی نەداوە بۆ دامەزراندنی پرۆژەیەکی مەعریفی شۆرشگێڕانە. لەم نێوەندەدا ئامانجی نەتەوەیی کورد تێکەڵ بە بەرژەوەندی سیاسیانەی وڵاتانی دراوسێ بووە. سەرەڕای ئەمانەش لە ڕووی مێژووییەوە کورد پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی و عەقیدەیی لەگەڵ عەرەبدا هەیە و جەللادەکەشی لەوێوە سەرهەڵدەدات.

٢- **سایکۆپۆلیتیک**: (پێکهاتەی ئەقڵی و نەستەکۆی کورد و بڕیاردانی سیاسی)

زۆر گرنگە شۆرشگێڕ هوشیار بێت، لەوەی کە لە چ هەل ومەرجێکدایە و چ هەنگاوێک بگرێتە بەر تا بەکەمترین تێچوون زۆرترین دەسکەوتی بێت. ئەم چەشنە بیرکردنەوەیە لەلایەن ئەو دۆخە سایکۆلۆژیەوە دیاریدەکرێت کە ئەو نەتەوەیە

خۆی تێدا دەبینێتەوە. گەر ئەو دۆخە سایکۆلۆژییە لە دۆخێکی دۆگماییدا بێت و بەرژەوەندی چەند کەسێکی لە پشتەوە بێت، زۆر جیاوازە لەو دۆخە سایکۆلۆژییەی مەعریفەیەکی لەپشتەوە بێ و بیرکردنەوەیەکی دینامیکی کاریگەری بەسەریانەوە هەبێت. واتە دروشم و سروود و ئاڵاو جوگرافیا لەم پرۆژەیەدانابنە ئامانج، بەڵکو مرۆڤ و بەهاکانی مرۆڤ دەبنە ئامانج.

کاتێ مرۆڤ بەرەورووی هەڕەشەیەک دەبێتەوە، وەڵامدانەوەیەکی دەبێت کە ڕێک پەیوەندی بە باری سایکۆلۆژی ئەو کەسەوە دەبێت. ئەو هەڕەشەیە ترسێک دەخولقێنێت و چەند ئەگەرێک ئامادە ئەبێت بۆ وەڵامدانەوە. ئەو ئەگەرانەش پەیوەندی پتەوی پشوەختیان بەو دۆخە سایکۆلۆژیەوە هەیە کە ئەو مرۆڤە یان ئەو گروپە خۆی تێدا دەبینێتەوە. ئەو حاڵەتەی تۆی تێدایە هۆکارێکی گرنگە یان ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە شێوەی وەڵامدانەوەی ئەو هەڕەشەیە. کورد کاتێ پشتی بە شاخ قایم بووە ڕاستەوخۆ بۆ وەڵامدانەوە، پەنا دەباتە بەر شاخ. شاخ یان سروشت بتەوێ و نەتەوێ دۆخێکی

سایکۆلۆژی بۆ ساز کردووه. هوشیاربوونەوە لەم دۆخــە کــە مرۆڤــی تــێدەکەوێت، پرۆســەیەکی سایکۆلۆژی دەخوازێت. وەڵامدانـەوەی لـەم چەشنە وەڵامدانەوەیەکی سادە و بێ بیرکرنەوەیە، واتـە بـە ئاستـێکی هۆشـیاریی و بیرکردنەوەیـەکی بـەرزەوە وەڵامی ئەو هەرەشەیە نەدراوەتـەوە. زۆر دووبـارە بوونـەوەی هەڕەشــە و وەڵامدانــەوەی ســادەی لــەم جــۆرە، پــەیتا پەیتا پەیوەنـدی نـێوان جــەللاد و قوربـانی دەئاڵۆزکـێنێ و جـەللاد توشـی نیرۆنیـەت (عوســابیەت) دەکــا و دەســت لــە هــیچ ناپارێــزێ و قوربـانیش بـەناوی بـەرگری کـردن لـە خـۆ و بـێ بیرکردنەوەیـەکی قـوڵ هەرچـی لەدەسـت بـێت بـۆ وێـرانکاری دەیکـات. ئـا لـێرەدا گەمەکە لـە گەمـەی سیاسـی و مـاف و ئـەرک دەچـێتە دەرەوە و دەبـێتە گەمەی تۆڵەو تۆڵەسەندنەوە، گەمەی مشک و پشیلە، گەمـــەی هەڕەشـــە و پاڕانـــەوە، گەمـــەی پرســـەو لاواندنــەوە، گەمــەی تورەبــوون و چەوســاندنەوە، گەمـــەی گریــان و بـــەزەیی پــێداهاتنەوە، گەمـــەی تازیـباری و دڵدانـەوە. وەلـێ ئامانجەکـە چـیەو، بـۆ کێیەو تا کەیە، لەبیردەچێتەوە.

### ٣- ڕادەی بەریەککەوتنی جەللاد و قوربانی

دووبارەبوونـــەوەی هەڕەشـــەو وەلامدانـــەوە، هەڕەشە لەلایەن جـەللادەوەو وەڵامدانـەوە لەلایـەن تاکـێک یـان گروپـێکەوە، کاریگـەری دەبـێت لەسـەر پەیوەنـــدی نـــێوان جـــەللادو قوربـــانی و دوبارەبوونـەوەی قوربـانیبوون ئاسـانتر دەکـات. قوربانیەکـــە دەبـــێتە هـــەڵگری کاراکتەرێـــکی دوالیزمانــە. لـــەدوورەوە هەرەشـــە دەکـات و لـــە نزیکەوە واتە لـە نزیـک جەللادەکـەوە دەپاڕێتەوە. ئـەم سـیفاتە لــە سـەرانی کـوردا بەدیدەکرێـت. لەســـەرەتادا هەڕەشـــە دەکـــەن و لـــە کـــاتی بەرەوڕوبونەوەدا پاراناوەیان پێوە دیارە. مرۆڤـی دروست، دروستانە پـرۆژەی خـۆی دادەمەزرێنـێت و لە کاتی بەرەوڕوبونەوەدا بەرگـەی ئەنجامەکانیـشی دەگرێت. بۆنمونە لەمەر کێشەی هەنوکـەی تورکیـاو کوردا، سـەرانی کـورد هەڕەشـەیان دەکـرد و شـەڕی کـورد و کوردیـان ڕەتـدەکردەوە، هــەروەک بڵـێی شەڕی کورد و کورد هێندە تابۆ بووە لە نـاو کـوردا هــەرگیز شـــەڕی وا ڕووینــەداوە. وەلــێ لــە کــاتی

بەرەورروبونەوەدا ڕەفتاری سەرانی کورد تەواو پێچەوانە بۆوە. ئەوان دەیانتوانی هەر لەسەرەتاوە دەست لەگەڵ یەکەکەدا تێکەڵ نەکەن، چونکە ئەوە زیان بە دۆخی ئێستایان دەگەیەنێت. ئیدی لە کاتی هەڕەشەی تورکیادا هێندە پێویستی بە پارانەوەش نەدەبوو. ئەم جۆرە گەمەیەی کورد لەم بارودۆخەی هەنوکە عێراقدا سومعەی سەرانی کوردی زۆر خراپ بریندار کردووە.

### ٤- ڕادەی ئینتمابوون:

ڕادەی ئینتمابوون بۆ گروپ یان نەتەوەیەک، کاریگەری دەبێت لەسەر قوربانیبوونی بەکۆمەڵ. کاتێ گروپێک بەرژەوندی خۆی وا دەبینێت کە جۆرێک ململانێ هەڵبژێرێت و ئەو جۆرە ململانێیە بە ئاستێکی ئایدیۆلۆژی وادا بەرێت، کەسانی تریشی تێوە گلێنێت، ڕەفتارێکی بێ مۆراڵە و سیاسەتێکی درێوە، نەک تەنها بۆ دوژمنەکەی بەڵکو بۆ نەتەوەکەی خۆیشی ڕەنگدانەوەیەکی نێگەتیفی دەبێت. بۆنمونە پارتێکی کوردی تێروانینی خۆی وا دەخاتە ڕوو کە ئەمە بۆ هەموو کوردە و داخوازی

گشت کوردێکە، بێگومان جەللادەکەش وا لێدەکات کە سزای خۆی گەر بەسەر هەموو تاکەکانی ئەو نەتەوەیەدا نەسەپێنێت، ئەوا سزای بەکۆمەڵ دەتوانێ ئەنجام بدات، هەروەک لە ئەنفال و کیمیاباراندا بەدیمان کرد. بەپێچەوانەشەوە هەر ڕاستە کە قوربانیش قین و ڕقی خۆی ئاراستەی گشت تاکەکانی ئەو گروپە یان ئەو نەتەوەیە دەکات کە جەللادەکەی لێوە هاتووە. لەم پرۆسەیەوە گشت ئەدگارە دزێوەکانی وەک ڕەگەزپەرستی، شۆڤێنیەت، سادیەت و نیرۆنیەت لەم زەلکاوەدا گەشە دەکات. وەلێ گەر بمانەوێ زانستیانە لە تەک ئەو ئایدیۆلۆژیایەی کە پارتێک هەڵیدەگرێت مامەڵە بکەین، ئەوا دەڵێین تێڕوانینێکە لەو تێڕوانینانەی کە دەیەوێت کێشەی نەتەوەیەک چارەسەربکات. ناکرێت و تاوانیشە دەرهەق بە نەتەوەی کورد کە ئایدیۆلۆژیای پارتێک بکرێتە ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیەک. بەپێچەوانەوە، دەبێت نەتەوە کۆمەڵێک پرنسیپی خۆی هەبێت، کە ئەو ئایدیۆلۆژیایانەی پێبپێوێت، بۆ ئەوەی بزانن تا چ ڕادەیەک ئەو ئایدیۆلۆژیایە لە خزمەتی نەتەوەی کوردایە. وەک

ئەم پێوەرەمان نیە، کەچی هەر گۆرانییش بە بالآیاندا دەوترێت.

## جەللاد و قوربانی لە گۆشەنیگای سایکۆ-سۆسیۆوە

گەر لە گۆشەنیگای سایکۆ-سۆسیۆوە لە کۆمەڵگا بڕوانین، ئەوا دەڵێین: مەبەستمان لەو دۆخەیە کە تاک و کۆمەڵ کار لە یەکتر دەکەن و هەڵسو کەوتی یەکدی ئاراستە دەکەن. لەم زانستەدا هەڵسوکەوتی مرۆڤ جێگەی لێکۆڵینەوەیە. وەلێ هەڵسوکەوتێک کە پەیوەندیدار بێت بە کەشوهەوای کۆمەڵگەوە. [٢]

گەر پەیوەندی جەللادو قوربانی لەوێدا بخوێنینەوە، ئەوا دەڵێین؛ بنەڕەتی کۆمەڵگە لەسەر پەیمانێک بەئاگا یان بێئاگا دامەزراوە. ئەو پەیمانە هەوێنێکە بۆ مەیین و ڕاگرتنی ئەو کۆمەڵگەیە و ڕۆحێکیشە بۆ زیندوو ڕاگرتنی جەستەی کۆمەڵگە. ئەو پەیمانەش ئەوەیە کە گشتمان لە گەڵ یەکدی دەبێ ڕاستگۆو سەرڕاست و خاوێن و بەخشندە بین تا کۆمەڵگە ببێتە ژینگەیەکی خۆشگوزەران. گەرەکە، هەموو تاکێکی ئەم کۆمەڵگەیە ئەم پەیمانە کەم تا زۆر جێبەجێ بکەن و بیپارێزن. ڕاگرتنی ئەو

پەیمانە کۆمەڵایەتیە لەلایەن تاکەکانەوە جۆرێک لە ژیان دەخوڵقێنن، پێی دەوترێ ژیانێکی دروستی بەهادار کە هەمووان بەو حاڵەتە بەختەوەر دەبن.
هەر مرۆڤێک ئەو متمانەیەی کە هەوێنی مانەوەی کۆمەڵگەیە لەبەرچاو نەمێنێت و باوەڕیشی بەوە نەمێنێت کە دوو لایەنەی ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتیە بە دروستی ماوەتەوەو هەر کە زانی پەیمانی کۆمەڵایەتی ڕوخێنراوەو شکستی هێناوە، ئەوا ئەندامانی ئەو کۆمەڵگەیە لە مرۆڤی ئاسایی دەردەچن و توانستی ئەوەیان نامێنێ کاری خۆیان وەک کائینێکی دروست ئەنجام بدەن. کەش و هەوایەکی مەترسیدار و ناخێکی نادروست و ترسێکی ڕووخێنەر لەو کۆمەڵگەیەدا خۆی پەخش دەکات. ئەو کارەی وا دەکات کە متمانە بەو پەیمانە نەمێنێت، تاوانکردنە دەرهەق بەتاکەکانی کۆمەڵگە، شێواندنی کەش و هەوای ئارامی کۆمەڵگایە، شکاندنی ملی یاساکانە لەپێناو بەرژەوەندی دەسەڵاتدار.[٣]

لێرەوە مەبەستی ئێمە ئاشکرا دەبێت کە بڵێین هەر تاوانێک ڕودەدات مانای بریندارکردن و

شکستهێنانه بەو پەیمانەی کە کۆڵەکەی دروستڕاگرتنی کۆمەڵگەیە. لەم حاڵەتەدا تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە گشتیان ترسی هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیمانە دوولایەنەیان لێدەنیشێت. ئەم ترسەش لەوەوە دێت، چونکە بە هەڵوەشاندەوەی ئەو پەیمانە، کۆمەڵگە دوچاری شپرزەیی و شێواوی و داڕوخان دەبێ و هیچ کام لەو تاکانە ئاسوودە و ئارام نابن. بۆ ئەوەی ئەم شکستە چارەسەر بکەن و ئەم شکاویە بخەنەوە جێگەی خۆی، سزا بۆ جەللاد و تاوانکار دادەنرێت. واتە لە ڕێگەی سزادانەوە پەیمانە کۆمەڵایەتییە شکاوەکە چاک دەکرێتەوە. هەر ئەم حاڵەتە سایکۆلۆژیەی تاکەکان بە تەنها سزای تاوانکارەکە نادات، بەڵکو قوربانیەکەش سەرزەنشت دەکات. چونکە ژیانێکی دروست و بەهادار تەنها بە ڕێگرتن لە تاوانکار یان جەللاد نیە، بەڵکو ڕێگرتنە لە قوربانیش کە نەبێتە قوربانی و بەرپرس دەکرێت لەوەی بۆچی دەبێتە قوربانی. جگە لەوەش ئەو کۆمەڵگەیە نایەوێ باوەڕ بەوە بهێنێت لە ناو تاکەکانیدا تاکێکی وا هەبێت کە ئەوەندە دڕندە و شێوا و تووڕە بێت بتوانێ تاوانی

وا ترسناک ئەنجام بدات، هەرلەبەرئەوەی ئەمە مەترسیەکی گەورەیە بۆ هەموویان، بۆیە هەندێکیش خەتا دەخەنە ئەستۆی قوربانیەکە. لەدیدی ئەم زانستەوە قوربانیەکەش ڕێگەی بۆ جەللادەکە خۆش کردووە تا ئەو جەللادە تاوانی خۆی ئەنجام بدات. پاراستنی ئەم هاوسەنگیە لە نێوان بەرپرسیارێتی جەللاد و بەرپرسیارێتی قوربانی لە ئەنجامدانی تاوانێکدا، دەبێتە هۆی هێورکردنەوەیەکی سایکۆلۆژی و ڕۆحی تاکەکان، تا بتوانن لە ژیانێکی دروست و بەهاداردا هەست بە ئارامی و ئاسودەیی بکەن. بیانوو هێنانەوەیەکە بۆ خۆدڵخۆشکردن بەوەی ئەگەر ئەم قوربانیە خۆیشی هەندێک خەتای نەبێت، ئەوا ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتییە دەڕووخێت و کۆمەڵگە دەکاتە کۆمەڵگەیەکی تۆقێنەر و مەترسیدار و نابێتە لانەی حەوانەوە بۆ مرۆڤ. ئەم سەرزەنشتکردنەی قوربانی جگە لەوەی هەندێک ڕاستی لە خۆی گرتووە، لە هەمانکاتیشدا ئازارشکێنێکی سایکۆلۆژیشە بۆ کۆمەڵگە. دەنا هەروا لە خۆرا نیە کە نەجیهانی عەرەبی و نەجیهانی ئەورووپیش ئەو

سۆزەیان بۆ قوربانیبوونی کورد وەک پێویست نەنواند. هەر بۆیە زۆرجار دەبینین ئەو بەزەییەی کە قوربانیەکە چاوەڕێیەتی ،ئیتر ئەو قوربانیە تاکێک بێ یان گروپێک زۆر کەمترە لەوەی کە بە تەمای بووە.[4]

## پرۆسەی پەیوەندی جەللاد وقوربانی

ژینگەیەکی نادروست و ناثاسایی بە بەردەوام مرۆڤگەلێکی دەرون چەوت و ڕۆح شکست دەخولقێنێ. دەرئەنجامی ئەم چەوتی و شکستیە، وەبەرهێنانی دووبەرەی، تاوانکار و تاوانلێکراو، ستەمکار و ستەملێکراو جاش و پێشمەرگەیە، واتە جەللاد و قوربانی. مەرجیش نیە لە کۆمەڵگەدا جەللاد هەمیشە بە جەللادی و قوربانییش هەمیشە بە قوربانی بمێنێتەوە، چونکە کۆمەڵگە هەڵگری سیفاتێکی دینامیکی گۆڕاوە، دەشێ جەللاد بێتەوە بە قوربانی و قوربانییش بێتەوە بە جەللاد. سایکۆلۆژیا پێی وایە کاراکتەری جەللاد و کاراکتەری قوربانی لە هەندێ ڕووەوە لەیەکدی دەچن. بۆ نموونە لە هەردووکیاندا ترسێک

بەبەردەوام وەک پاڵنەرێکی نەستی کارایە و لەسەر ڕەفتار و ڕەوتی ئەو دوو مرۆڤە ڕەنگ دەداتەوە. دوور لە داخوازی یاسا و سیاسەت، سایکۆلۆژیا پێی وایە ئەم ترسە هەم لە جەللاددا و هەمیش لە قوربانیدا دەبێ چارەسەر بکرێت. لەسەر ئەم بنەمایە لە بیروبۆچوونی مرۆڤدۆستانی ئەم سەردەمە لەئەورووپادا چەند گرنگی بە قوربانی دەدەن، هێندەش گرنگی بە جەللاد دەدەن. ئەوان باوەڕیان وایە کە جەللاد و قوربانیش هەردووک هەڵگری جیهانبینیەکن سۆز و خۆشەویستی تێیدا شکستی هێناوە. واتە بە گوێرەی زانست هەردووکیان، ئەو دۆخە دروست و سروشتیەیان لە کیسچووە و ناتوانن بە ئاسانی بوونی خۆیان لە بارێکی دروستدا ڕاگرن و هەڵچوونی دەروونی کۆنترۆڵ بکەن و بە ئاستێکی ئەقلانی و پتەو ململانێکانیان ئەنجام بدەن.

خاڵێکی تری هاوبەش لە نێوان جەللاد و قوربانیدا کە زۆر گرنگە، ئەوەیە هەردوولا خاوەنی ستراتیژیەتێکی ڕوون و ئاشکرا نین، تا بتوانن پلانێکی درێژخایان بۆ پرۆژەیەک دارێژن و ڕووداو

دروســـت بکـــەن و ڕەوتی مـــێژوو بگـــۆڕن. بـــەڵکو بەبەردەوام ڕووداوی هەنووکەیی سەرقاڵیان دەکات و ڕاپێچیان دەکات. لە هەمانکاتدا هەرگیز خۆیان بە بەرپرســـیاری دەرئـــەنجامی کارەکانیـــان نـــازانن، هەمیشە ئەویدی تاوانبـار دەکەن. لـەوەش سـەیرتر ئەوەیە کە زۆربەی جەللادەکان خۆیان بـە قوربـانی کۆمەڵگــە دەزانــن. لــە تـێروانینی قوربانناســیەوە جەللاد و قوربانی هەردووک حاڵەتی بوونی خۆیـان ونکردووە. لای ئـەوان هۆکـار، ڕۆژگـار، شوێن زۆر گرنگ نیە، گـرنگ ئەوەیـە لـەو کاتـەی ئـەو جـەللادە یان ئەو قوربانیـە کـە ڕووبەڕووی ترسـێک دەبـێتەوە، بێ بیرکردنەوەی قوڵ، وەڵام بداتەوە. سیفاتێکی دی هـاوبەشـی زۆر گـرنگ لـە نێوان جـەللاد و قوربـانی ئەوەیە کە نایانەوێ بە مێژووی خۆیانـدا بـچنەوە و کەلێن و کەلەبەری ڕەفتارەکانیـان بدۆزنـەوە و لـێی بکۆڵنەوە. هەردووکیان لـە ئاستـێکی هۆشـیاری وادا نـین تـا بتـوانن هەسـت بـە ئازارەکـانی ئـەوانی دی بکەن. ئەم سـیفەتانە زیـانی گـەورەش بـە پەیوەنـدی تاکـــەکان دەگەیێنـێت و نـــاتوانن پـــێکەوە بـــژین و یـــەکانگیربن، هـــەرکاتێ ناکۆکیـــەک ڕوو بـــدات، گـــەر

لەهەمبەر تاکێک بێت، گرووپێک بێت یان پارتێکدا بێت لە بری ئەوەی بەخۆیانا بچنەوە، بەبەردەوام بەرامبەرەکەیان تاوانبار دەکەن.[٦]

هەردووک جەللاد و قوربانیش دەبێ وەک یەک فێری چەشنێک لە ژیان بکرێن، تا ئەو حالەتە شکستیە تێپەڕێنن و سەرلەنوێ دروستبکرێنەوە. دروستبوونەوە یانی پێکهاتنەوەی پارچە هەڵوەشاوەکانی کەسێک، تا هەست بە یەکبوونەوەی خودی خۆی بکات. ئەو مرۆڤانەی لە دۆخێکی ترسێنەر و تۆقێنەر و بێ سەرپەرشتیدا دەگوزەرێن، چانسی ئەوەیان زۆرە کە دووچاری شکست وپوکانەوە بن. دەکرێ چارەسەری ئەم حاڵەتە بکرێ بە هۆی میتۆدێکی زانستیەوە کە پێی دەوترێ **میتاکۆگنیتیڤ**. ئەم میتۆدە پارچە هەڵوەشاوەکانی تاکێک یان گەلێک بە ئاراستەیەکی دیاریکراودا دەبات و مرۆڤ ئامادە دەکات کە هەست بە یەکبوونی خۆی بکات و ئەو کائینەی لێدروست بێ کە بتوانێت خودی خۆی( حاڵەتی بوونی) لە ڕووداوەکاندا، کۆنترۆڵ بکات.

ناسنامەیەکی دامەزراو و پتەوی دەداتێ و بەرژەوەندی باڵای لا دەخوڵقێنێ.

(حاڵەتی بوون) ئاماژەیە بۆ یەکبوونێکی تێکهەڵکێش و پێکەوە بەستراوی دابەش نەبووی هۆشیاری، سۆز، جەستەیی و ڕەفتار. ئەم حاڵەتی یەکبوونە ئاستێکی هۆشیاری بەرز دەخوازێت بۆ ڕاگرتن و کۆنترۆڵکردنی و ئەمەشیان گەشەکردنێکی دروستی دەروونی و ڕوحی و جەستەیی دەخوازێت، تا بزانێ دۆخێکی کۆمەڵایەتی، دۆخێکی تایبەتی حاڵەتی بوون دەخوازێت. پەروەردیارێکی هەستیار زۆرگرنگە بۆ دروستبوونی ئەم حاڵەتە. جەللاد و قوربانی زۆربەی جار ئەم دۆخ و بارە دروستەیان لە دەست چووە. هەرکاتێ مرۆڤ ژیاننامەی جەللاد و قوربانی بخوێنێتەوە، دەبینێ کە جەللاد و قوربانی لە کەش و هەوایەکی دروستدا گەشەیان نەکردووە.[7] گەر مێژووی ئەم چارەکە سەدەیەی کوردی باشوور بەچاوێکی زانستیانە بخوێنینەوە، هەڵبەتە ئەم پەیوەندیەی نێوان جەللاد و قوربانی، واتە کوردی قوربانی و عەرەبی جەللاد یان بەعسی

جەللاد و پارتی و یەکێتی قوربانی بەدی دەکەین. بەپارەکەی تریشدا چۆن کورد لە پاش ڕاپەڕین ئەبن بە جەللاد و عەرەبیش ئەبێتەوە بە قوربانی. ڕونتر بڵێین چۆن پارتی و یەکێتی لە ئاستی یەکتر دەبنەوە بە جاش و پێشمەرگە. ئەمانە بەڵگەن لەسەر پەیوەندی دینامیکیەتی نێوان جەللاد و قوربانی.

خاڵێکی تری زۆر گرنگ لەمەڕ پەیوەندی نێوان جەللاد و قوربانی، ئەوەیە کە بەجەللاد بوون یان بەقوربانیبوون، پرۆسەیەکی مێژووییە، نەک ڕووداوێک بێت کتوپڕ سەرهەڵدات. ڕووداوێکە خاڵی دەستپێکردنی هەیە و هێندی هێندی حاڵەتێکی دەروونی سەخت دەخولقێنێت و سایکۆلۆژیا ناوی نیرۆنیەت (عوسابیەت)ی لێناوە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەبەستە، زانایەکی جولەکە بە نموونە دەهێنمەوە، کە چۆن پەیوەندی نێوان جولەکەو مەسیحی وەک پرۆسەیەکی مێژوویی دەگێڕێتەوە و دەگاتە ئەو ئاستەی هیتلەرێکی عوسابی وەبەر بێنێت و هۆلۆکۆست ئەنجام بدات.[٨]

ئەم زانایە مێژوونوسێکی ئیسرائیلیە بە ناوی یاکوب تالمون. یاکوب لە بارەی هۆلۆکۆستەوە دەڵێ: هۆلۆکۆست ڕێگە دان بوو بە توندڕەوی، واتە نەمانی هیچ جۆرە بەربەستێکی ڕەوشتی و مرۆیی. یاکوب پێی وایە توندڕەوی هەروا ڕووداوێکی کتوپڕ نیە و لە خۆڕا سەرهەڵنادات، بەڵکو پرۆسەیەکی درێژخایانی هێمنە. هۆلۆکۆست بە بۆچوونی ئەو دەرئەنجامی پەیوەندیەک بووە لە نێوان مەسیحی و یەهودیدا کە هەر لەسەرتاوە پڕبووە لە توخمی نیرۆنی (عوسابی).

عوسابی لەو حەز و خۆزگە توند و ناچارەکیەوە سەرهەڵدەدات و دەبێتە پاڵنەرێکی بە تین و ئەوتۆی پڕ لە سۆز و هەڵچون و وروژاندن کە بە چەشنێکی ناسروشتی وەڵامی ئەزموونێکی قەیراناوی پڕ شۆک کە زووتر ڕوویداوە، دەداتەوە. واتە مێژوویەک بەسەر ئەو حاڵەتە قەیراناویەدا تێپەڕیوە و بە بەردەوام هەڵگری حاڵەتێکی پەنگ خواردوو بووە، کە لە ناکاودا بە چەشنێکی ناسروشتی دەتەقێتەوە.

یاکوب ئەو عوسابیەتەی ناو مەسیحیەکان لەوەوە دەبینێ کە ئەوان واتە مەسیحیەکان یەهودیەکانیان

بە بکوژی مەسیح زانیوە. ئەو مەسیحەی کە لە چاوی ئەوانەوە فریادڕەسێکی مرۆڤایەتی مەزن بووە. لەوەش گرنگ تر مەسیحێک کە خوا بوە و هاتۆتە سەر زەمین، کەچی یەهودیەکان ئەو خوایەیان ئەشکەنجەداوە و کوشتویانە. لە هەمانکاتدا ئەوەش لە زیهنی مەسیحیەکاندا چەسپاوە کە یەهودیەکان پیاوکوژبوون، بۆیە مەسیحیەکان لێیان جیابوونەتەوە. ئەمە بە شێوەیەکی گشتی حاڵەتی دەروونی مەسیحیەکان بووە بەرامبەر یەهودیەکان. وەلێ لە ناو مەسیحیەکانی ئەڵمانیا ئەم حاڵەتە دەروونیە ئاستێکی پتر ئاڵۆز وەردەگرێت. لای ئەڵمانەکان ئەو ئایدیۆلۆژیایەش دروست ببوو کە دوو کەلتوور لە ئارادایە: کەلتورێکی پیر و کۆن کە یەهودیەتە و کەلتورێکی نوێ کە کەلتوری ئەڵمانیە. لە ناو ئەڵمانیەکاندا لەسەردەمی هیتلەردا ئەو بۆچوونەش هەبوو کە ئەوەی بێ باوەڕبێ، لاوازو پاشکۆش دەبێ. بۆیە لای ئەوان پرسیارێک سەری هەڵدا بوو: بۆ دەبێ یەهودیەکان کە هێندە لاواز و پارێزگار و سوک بن، کەچی هێشتا هەر لەڕیزی باوەڕدارانـدا

مـــابن؟ مەســـیحیەکان ڕێـــگەیان بـــە خۆیـــان دابـــوو جولەکەکان دەرکەن و ڕسوایان بکەن، وەلێ بۆیـان نەبوو بیانکوژن، چونکە ئایەتێک لە ئینجیلدا هەیە ئەڵێ: *نابێ ئەوەی لە پەناتایە بیکوژیت.*

ســـەرباری ئەمانـەش هـــەمووی لەســـەدەی هـــەژدە و نـــۆزدەوە، چـــەند هۆکارێـــکی دی ئـــابوری و بگـــرە فەلـــسەفیش هـاتنـــە ســـەر ئـــەو فاکتـــەرە مـــێژووییەی پێـــشوو و بوونـــــە فاکتـــــەری خەســـــتکردنەوە و پتـــەوکردنی ئـــــەم جـــۆرە عوســـــابیەتە لــــە نـــــاو ئەڵمانیەکاندا. لەو سەردەمەدا ئەڵمانیەکان جۆرێـک لە هەڕەشە یان ترسێکی ئایدۆلۆژی داگیریکردبوون، ئایین و بەگزادە و سەرمایەداری بە سەرچاوەی ئەو هەڕەشـــەیە لـــە قەڵـــەم دەدرا. یەهودیـــەکانیان بـــە سەرچـــاوەیەکی گرنگـــی ئـــەم هەڕەشـــەیە دەزانی، چـونکە یەهودیـەکان هەمیـشە لەگـەڵ ئـەو لاوازی و بـــێدەسەڵاتیەدا، ســـــەرمایەدار بـــــوون و جـــــێگە و ڕێگەیەکی باشیـشیان لـە ئـەڵمانیادا وەدەسـت هـێنا بـــوو، ســـــودی زۆریـــــشیان لـــــە ســـــەردەمی مۆدێـــرنە وەرگـــرت بـــوو. تەنانـــەت فەیلەسوفـــێکی وەک نیتـــچە بـــاوەڕی وا بـــوو کـــە ڕەنگـــە لـــە داهـــاتوودا جولەکـــە

لەگەڵ بەگزادەکاندا یەکگرن و چینێکی ئابووری پتە و لە ناو کۆمەڵگەی ئەڵمانیدا پێکبهێنن و هەموو بوارە ئابوورییەکانی دی داگیر بکەن. هەروەها نیتچە پێی وا بوو کە تا ئەوکاتەی ئەویش ڕەگەزی یەهودیەکان، سەرباری ئەو هەموو کارەساتەی بەسەریاندا هاتووە، بە خاوێنترین ڕەگەزن ماونەتەوە. لەولاشەوە تەشەنەکردنی تیۆری پەرەسەندنی داروین کە پێی وایە مانەوە بۆ بە (هێزەکانە) هێندەی تر ئەڵمانەکانی دنە دابوو بۆ لەناوبردنی گەلێک، ڕەنگە هەرەشە بێت بۆیان. لای هیتلەریش ئەو ئایدیۆلۆژیایە دروست بووبوو کە ڕەگەزی ئاری دەبێ خاوێنترین و بالاترین ڕەگەز بێت. دەرەنجامی ئەم فاکتەرانە ئایەتی (*تۆ نابێت کەس بکوژیت*) لە ناو مەسیحیەکانی ئەڵمانیادا هەرەس دەهێنێت.

ئەم تێڕوانینەی ئەڵمانەکان سەبارەت بە یەهودیەکان هەروا ژێربەژێر و هێندی هێندی سترەکتوری نەستی ئەوانی پێکهێناوە و نەوە بەنەوە وەک کەلتورێک گوێزراوەتەوە، تا دۆخێکی وا دژواری لە ئەڵمانیادا بەرامبەر یەهودیەکان

خولقاند کە لە هیچ ولاتێکی تری مەسیحیدا ئەو دۆخە بەو دژوارییە نەخولقابوو. ئەوە بوو کارەساتێکی ناسروشتی وەک هۆلۆکۆستی بە ئاسانی لێکەوتەوە.

گەر هەر بەم چاوەوە لە مێژووی پەیوەندی کورد و عەرەب بڕوانین، لەوە تێدەگەین چۆن ڕژێمی بەعس توانی تاوانی ئەنفال و کیمیاوی بە ئاسانی ئەنجام بدات. لەوەش تێدەگەین تا چ ڕادەیەک ئەو پەیوەندییە مێژووە خوێناوییەی کورد و عەرەب یان کورد و حکومەتی ناوەندی لە عێراقدا کاریگەری بووە لە ڕوودانی کارەساتی ئەنفال و کیمیاوی. تەنانەت لەوەش تێدەگەین بۆ سەرانی بەعس لە دادگایی کردنیاندا زۆرجار دەیانتوانی پاساو بۆ تاوانێکی لەو جۆرە بهێننەوە و خۆیان بە جەللاد نەدەزانی بەڵکو خۆیان وەک قوربانی دەخستە بەرچاوی جیهان.

## بەشی دووەم

## ڕۆحی کورد لە بن دەستی ئیسلامیزم دا

لە بەشی پێشودا دۆزی کوردمان لە گۆشەنیگای نەتەوایەتیەوە خوێندەوە و لەوە تێگەشتین کە کورد وەک نەتەوە پرۆژەیەکی ناسیۆنالیزمانەی لەخۆنەگرتبوو، بەڵکو تەنها وەلامدانەوەیەکی سادەی سەرەتایی بوو بۆ دۆخی کوردو بە ئاستێکی نەتەوەبووندا نەڕۆشتووە. لەم بەشەدا هەوڵدەدەین دۆزی کورد لە گۆشەنیگای ئاینییەوە بخوێنینەوە، تا لەوە تێبگەین ئاخۆ بزاڤی ئیسلامی، کوردی بەو ئاقارەدا بردووە تا کورد وەک نەتەوەیەک بەرەو خۆدروستکردن بەرێت.

لە ناو کوردا ڕەوتێکی تر کە پتر لە چارەکە سەدەیەکە چالاکەو گوتاری سیاسی تایبەتی خۆی هەیە و بەباکگراوندێکی ئیسلامیەوە لە کێشەی کورد و دۆزی نەتەوایەتی کورد دەڕوانێت. ئەم

ڕەوتە لە جیهانی ئیسلامی و لە کۆمەڵگەی کوردیدا تا هەنوکەش کاریگەری بەربڵاو و پتەوی هەیە،بە پێچەوانەی ڕەوتی تەقلیدی و سۆفیگەری، تا ڕادەیەکی باش بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی سوودی لە هۆکارەکانی دنیای مۆدێرنە وەردەگرێت و بەکاریان دەهێنێت. ئەم ڕەوتە چالاکە و ئاراستەی زۆرێک لە تاکەکانی کوردی گۆڕیوە و بە چەشنێکی بەرچاویش گوتاری خۆی بە ئاراستەی گوتاری ناسیۆنالیزمیدا بردووە.

ئیسلامی سیاسی لە کوردستاندا شتێک نیە هەروا کتوپڕ و پاش ڕاپەڕین سەری هەڵدا بێت، بەڵکو مێژوویەکی درێژی خۆی هەیە. هێندەی من ئاگادار بم بزاڤێکی ئیسلامی وەک ئیخوان ئەلموسلمین لە نیوەی سەدەی ڕابردووەوە لە عێراقدا چالاکە و بانگەشەی خۆی دەکات. ئەم بزاڤە لەسەرەتادا هێندەی مۆرکی ڕەوشتگەری و سۆفیگەریان پێوە دیار بوو هێندە مۆرکی سیاسەتی پێوە دیار نەبوو، بەڵام هێندەی پێنەچوو ئەم ڕەوتە لەگەڵ سەرهەڵدانی کۆماری ئیسلامی ئێراندا لایەنی

سیاسی تیایدا گەشەی سەند و لە عێراق و وڵاتانی عەرەبی هاتە گۆڕەپانی خەباتی سیاسیەوە -بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە پێم وا بێ ئیسلامیەکان دروستکراوی سیاسەتی ئێران بن، نەخێر، بەڵکو دیاردەیەکی ئاساییە کە مرۆڤ دەکەوێتە ژێر کاریگەری دەوروپشتی-. تەنانەت زۆری پێنەچوو چەندین گروپی چەکداریش لە ژێر سایەی ئەم ڕەوتە سیاسەدا واتە ئیخوانولموسلمین دەرباز بوون وخۆیان جیاکردەوە و دەستیان دایە چالاکی چەکداری، بەبۆچونی ئەوسای ئیخوان ئەم گروپانە لادەربوون لە ڕێبازی ئیخوان.

وەلێ ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە کە ئەم بزاڤە لە دەرئەنجامی کاردانەوەیەکی سیاسی ئەوسای جیهانی سەرهەڵدێنێت. ئەو سەردەمەی کە بزاڤی ئیخوان تێیدا سەری هەڵدا سەردەمێک بوو، جیهانی عەرەبی لەهەمبەر جیهانی ڕۆژئاوا و کۆلۆنیالیزمدا ڕاچڵەکی بوو. لێرەدا نامەوێ ئەم بزاڤە ناوبنێم بزاڤێکی هوشیارانە، چونکە لەڕووی سایکۆلۆژییەوە جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوان

ڕاچڵەکین و هۆشیاربوونەوەدا هەیە. ڕاچڵەکین لە ئەنجامی شۆکێک پەیدا دەبێ و پێویستە درێژە نەکێشێ و هۆشیاربوونەوەی بە دوادا بێت. دەشێ ڕاچڵەکینەکە درێژە بکێشێ و هۆشیاربونەوەی بە ئەستەم بەدوادا بێت، تا لێرەدا کەلتوور و مێژوو و جۆری بیرکردنەوەی ئەو کۆمەڵگایە ڕۆڵی خۆی لە دواکەوتن و پێشکەوتنی هۆشیاربوونەوەدا، ئەبینێ. لەو بڕوایەدام لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا و بە کوردیشەوە دۆخی ڕاچڵەکین زۆر درێژەی کێشا و تا هەنوکەش هەر بەردەوامە. خودی بزاڤی ئیسلامیش فاکتەرێکی گرنگترە لەدرێژەکێشانی ئەو ڕاچڵەکینەدا. لە ووتارێکمدا کە لە ساڵی ٢٠٠٠ دا بڵاوکرایەوە بە ناوی- خوێندنەوە و بە ناکامکردنی پرۆژەی ژیاری - لە وێدا ئاماژەم بەوە دابوو کە تەشەنەکردنی بزاڤی ئیسلامی لە حاڵەتی ڕاچڵەکیندایە نەک ڕابوون. ئەم بۆچوونەم پێویست ناکا هیچ لایەک سەغڵەت بکات. چونکە مەبەستی من زانستیانەیە و پشت ئەستوورە بەو واقعەی کە چەندین ساڵە گیرۆدەی بوین.

لێرەوە هەوڵدەدەم هەندێک بە مێژوودا بچمەوە تا بتوانین لەمرۆی ئیسلامی سیاسی کورد تێگەین. بە درێژایی مێژوو چەندین ململانێی مەعریفی و چەکداری لە نێوان رۆژ هەلآت و رۆژئاوادا هەبووە، تا دەگەینە ئەو سەردەمەی کە ئیسلام وەک ئایینێکی نوێ و مەعریفەیەکی پێشبڕکێکەر لەگەڵ ئایینی مەسیحی و یەهودی و زەردەشتی سەرهەڵدەدات و دەبێتە جێگەی سەرنج و سەرسامی نەک تەنها موسوڵمانەکان بەڵکو گشت مرۆڤەکانی ناوچەکەو دەوروبەریشی. لەگەڵ تەشەنەسەندن و گەشەکردنی ئایینی ئیسلام هەم وەک دەسەلآتێکی مەعریفی و هەم وەک دەسەلآتێکی سیاسی و فەرمانڕەوایی، مەودای ئایینی یەهودی و مەسیحی بەرتەسک دەبووەوە. ئەم دۆخەی ئیسلام پاش چەند سەدەیەک لە پەیدابوونی، وایکرد مەسیحییەکان توشی راچڵەکین بکات و جەنگی خاچ پەرستان روو بدات و بە بەردەوامیش موسوڵمانەکان لەو جەنگانەدا سەرکەوتوو دەبوون. هەرهەمان دۆخی ئیسلام بۆ موسوڵمانەکان بووە مایەی شانازیکردن و شکۆداری و متمانە بەخۆکردن، ئەم دۆخە کە

درێـژە دەكێـشێ، مـرۆڤ توشـی لـەخۆبایی بـوون دەكات و خۆی بە جوانترین و چاكترین كـەس دێتە بەرچـاوو دوچـاری خودشـەیدایی دەبـێ. وەلــێ جیهانی ئیسلامی لەو گۆرانكارییە جەوهەرییەی كە جیهـــانی ڕۆژئـــاوا تیایـــدا ســـەدەی ناوەراســـتی تێدەپەڕێنـــێت و دەرەنجـــام سەردەمـــێكی نـــوێ سەرهەڵدەدات، لەم نوێگەرییە جیهـانی ئیسلامی لـێ بێ بەش دەبێ. كاریگەری ئەم گۆرانكارییـە لـە پـاش سەدەی نۆزدەوە لە جیهـانی ئیسلامدا بەدەركـەوت. لـە پـاش سـەدەی نـۆزدەوە لـە ڕۆژ ئـاوا گۆڕانكـاری گەورە و خـێرای وا لـە بـواری فەلـسەفە و زانـست و تەكنەلۆژیا سـەریهەڵدا، بـووە هـۆی سـەروبنكردنی مەعریفـــەی ئـــایینی و سیـــستەمی كۆمەڵایـــەتی و سیاســی. ئــەم گۆڕانكارییــە بــە شۆڕشـێكی مــەزن ناوزەنــد دەكــرێ. چــونكە لــە دەرئــەنجامی ئــەم شۆڕشــە، ڕۆژئاوایـەكی دی سـەریهەڵدا كـە جیهـانی ئیسلامی سەرسام كـرد. لاوازی سیـستەمی سیاسـی و كۆمەڵایەتی و ئابوری و سوپایی جیهانی ئیسلامی بە تایبەتی جیهانی عـەرەبی توشـی شـۆک و ڕاچڵەكین كــرد و بــۆ دەربــڕین و گوزارشــتكردن لــەو بــارە

ناهـەموارە ئـەو جیهانـە دابـەش بـوو بەسـەر چـەند بەرەیەکدا. هەندێ پێیان وا بـوو دوورکەوتنـەوە لـە ئیـــسلامی ڕاســـت و دروســـت توشـــی ئـــەم بـــارە ناهـــەموارەی کـــردون، بۆیـــە گەڕانـــەوەیان بـــۆ لای ئیسلام هەڵبژارد، وەک بزاڤی ئیخوان ئەلموسلمین کە دەتوانین بەگشتی ئەم بزاڤانەی جیهانی ئیسلامی بەبەرەی گەڕانەوە بۆ ئیسلام ناوزەد بکەین. هەندێ تـــر پـــێیان وا بـــوو زیندووکردنـــەوەی هەســـتی نەتەوایـەتی ڕێگە چـارەیەو جەختکردنـەوە لەسـەر لایـەنی نەتەوایـەتی عـەرەب بـە گرنگتـر دەبینـرا و پێیان وابـوو هـەر نەتەوەیـەک تایبەتمەندێتی خـۆی هەیـە و نـاتوانین لـەو سـەردەمەدا کێـشەی گـشت نەتەوە جیاجیاکانی ناو ئیسلام پێکەوە ببەستنەوە، دەتوانین ئەم ئاراستەیەش لە ناو بەرەی نەتەوایەتی نـــاوزەد بکـــەین. هەنـــدێ تـــر نـــە ئیـــسلام و نـــە نەتەوایـــەتیان هەڵبـــژارد، بـــەڵکو کەوتنـــە ژێـــر کاریگـەری بیروبۆچـونەکانی مارکـسەوە. کێـشەی جیهانی ئیسلامی لای ئەم بەرەیە کێشەی مرۆڤ بـوو کە لە ململانێی چینایەتیدا دەبینرایەوە. گەر مـرۆڤ بـە چاوێـکی بابەتیانـەوە بروانێـت، هەسـت دەکـات

هەریەکە لەم بەرانە راستیەکی پێیە، وەلێ هیچکامیان پرۆژەیەکیان پێ نەبووە کە گشت رەهەندەکانی مرۆڤی جیهانی ئیسلامی بگرێتەوە، یان پێکەوە جیهانی ئیسلام یان مرۆڤی موسڵمانیان بەئاراستەیەکی هوشیاربوونەوەدا ببردایە. بەهەرحاڵ جیهانی ئیسلامی کەرت بوو و ئەم کەرتبونەی جیهانی ئیسلامی کوردیش پشکی خۆی بەرکەوت. هەروەک بزاڤی نەتەوایەتی لە باشوری کوردستان سەریهەڵدا، بزاڤی ئیسلامیش لەو بەشەدا گەشەی سەند.

رەنگە لێرەدا پرسیارێک زۆر گرنگ بێت، ئەویش ئەوەیە بۆچی بزاڤێکی ئاینیی وەک بزاڤی ئیخوانولمسلمین دەتوانێ بەشێکی زۆری نەتەوەی کورد بە لای خۆیدا ڕاکێشێت؟ زۆرێک لە ڕۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی کورد و تا ئێستەش هەندێکیان ئەم دیاردەیە -دیاردەی بەربڵاوی بزاڤی ئیخوانولموسلمین لەناو کوردا- بە پیلانی داگیرکردن ناوزەند دەکەن. بەڵام بە بۆچوونی من ناکرێ دیاردەیەکی لەم جۆرە قوڵ و ڕەگ داکوتاوە بەشێوەیەکی ئەوا سادە لێک بدەینەوەو ئەویش

لەدەلاقەی پیلان و پیلانگێڕیدا ڕیزبەند بکەین. جگە لەوەش ئەم جۆرە شیکردنەوەیە بۆ بزاڤی ئیسلامی، هەروەک شیکردنەوەی ئیسلامیەکان وایە بۆ ڕێبازە نەتەوایەتیەکان، کە گوایە نەتەوایەتی زادەی بیری ڕۆژئاوایەو بە حەرامیان دەزانی. هەمیشە من لەگەڵ ئەم دوو بۆچوونەدا ناکۆک بووم. نە بزاڤی ئیسلامی و نە نەتەوایەتی بە پیلان دانانێم، بەڵکو بەدیاردەیەکی سروشتی مرۆڤایەتی دەزانم، وەلێ ئەم مافە سروشتیە چۆن مامەڵەی لە تەکدا دەکرێت، ئەوە کێشە بنەڕەتیەکەیە!

نەتەوەیەک کە نزیکەی هەزاروچوارسەد ساڵە هەڵگری ئایینی ئیسلام بێت، شتێکی نامۆ نیە کاتێ بەشێک لەم نەتەوەیە ڕوو بکاتە بزاڤێک کە لە ڕێبازە تەقلیدیەکانی تری ناو ئیسلام مۆدێرنانەتر ئیسلام بخاتەروو. جگە لەوەش جیهانبینی ئەم بزاڤە بریتی بوو لە گەڕانەوە بۆ لای سەلەف (پەیامبەرو هاوەڵەکانی) کەبە بۆچوونی ئەوان سەلەفیەت نموونەیەکی جوانی ڕەوشت و پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی پتەوی خوڵقاند بوو. هەروەها لە ناو ئەم بزاڤەدا هەوڵێکی بەرچاو

دراوه کـه زانـست لـه لـێکدانه‌وه‌ی قورئانـدا بـه‌کار بهێنرێت. **سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش، ئه‌م بزاڤه ته‌نها بزاڤێکی سیاسی نه‌بوو به‌ڵکو بزاڤێک بوو وه‌ڵامی پێ بوو بـۆ ئه‌و پرسیارانه‌ی که مرۆڤ به گشتی له‌سـه‌ر ژیـان و مردن لای دروست ده‌بێ. له‌م لاشه‌وه هـه‌روه‌ک -لــه پێشه‌وه ئاماژه‌مان پێدا- ڕێـبازه نه‌ته‌وه‌ییـه‌کانیش نه‌یانتوانیوه گوزارش له ڕوحی نه‌ته‌وه‌ی کورد بکه‌ن و ئه‌و ڕه‌هه‌نده ڕوحیه‌ی بـۆ پـڕ بکه‌نـه‌وه.** بۆیـه مـن هـۆی دیـارده‌ی ڕه‌گ داکوتـانی ئـه‌م بزاڤـه عه‌ره‌بیـه ئیسلامیه له‌ناو کوردا به‌دیارده‌یه‌کی سروشتی دوور لـه پـیلان ده‌خوێـنمه‌وه، بـه تایبـه‌تی کـه کـورد وه‌ک نه‌تــه‌وه خــۆی هــیچ وه‌ڵامــێکی بــۆ ئــه‌و پرســیاره وجودیانــه پــێ نه‌بــێت. جگــه لــه‌وه‌ش هه‌ڵــه‌ی ئیخوانولمـسلمین لـه‌وه‌دا نـه‌بووه کـه بـه نیـازی پیلانگـێڕان خۆیـان خزانبێته نـاو کـورده‌وه، بـه‌ڵکو هه‌ڵـه‌ی ئـه‌وان، وونکـردنی مـێژوویه‌کی سروشـتی و ئاسایی ئیسلام خۆی بووه، ئه‌وان بازێک لـه سـه‌ده‌ی بیـسته‌وه‌مه‌وه به‌ســه‌ر ئـه‌و مـێژووه پـڕ ململانــێ مه‌عریفی و فیکریه‌دا ده‌ده‌ن بۆ سه‌رده‌می سـه‌ره‌تای

دامەزاندنی ئیسلام. بۆیە هەڵگرانی بیری ئیخوان زۆر گرنگی بە زانیاری پرۆسەی مێژوویی درێژی ئیسلام نادەن. هەڵەی کوردیش لە چونە ناو ئەو بزاڤە لەوەدایە لە لایەکەوە لایەنێکی مەزنی مەعریفەی مێژووی ئیسلامیان لە کیسچوەو، لە لایەکی ترەوە کێشەی ناسنامە و بوونی کوردیان لەدەستداوە. جیاوازی کوردو عەرەب لەوەدایە کە عەرەب ناسنامەی خۆی هەبووە، وە لێی ونیکردووە، بە ڕێگای هەڵەو ڕاستکردنەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕێی لێ دەکەوێتەوە. بەڵام کورد هێشتا ناسنامەی تایبەت بە خۆی بۆ دروست نەبووە، تا بە دووی عەرەبیشەوە بێت، هەر بۆی دروست ناکرێت. واتە کوردو عەرەب لە دوو دۆخی زۆر جیاوازدان و ناتوانن پێکەوە ڕێگا بکەن. ئەگەر هەر بیانەوێ پێکەوە بمێننەوە، ئەوا کورد هەر برابچوکە و بەکەمتر لە عەرەب سەیردەکرێت. هەروەک فارسەکان بە گاڵتەجارییەوە بەو کوردانەی کە داوای سەربەخۆییان کردبوو، پێیان وتبوون گەر کتێبی سەعدی ئێمە نەبێت ئێوە لەشەوانی زستاندا چیتان هەیە شەوگاری پێبەرنە سەر، هەرواش

عەرەب پێمان دەڵێن گەر قورئانی ئێمە نەبێت چی ئێوەی لە سەرلێشێواوی رزگار دەکرد. ڕاستیش دەکەن، چونکە کورد لە ڕێگەی ئیسلامەوە بە بەردەوام بە عەرەبەوە لکاوە و ناتوانێ لێی جیا بێتەوە. ڕەنگە لێرەدا ئەو پرسیارە بکرێ کە نەتەوەی تریش هەن و موسولمانیشن و ڕادەی تەبەعێتیان بۆ عەرەب بەو شێوەیە ئەستور نیە و ئیسلامیش نەبووەتە ڕێگر تا خۆیان دروست بکەن!! ئەم پرسیارە لەجێی خۆیدایە، وەلێ پرسیارێکی دیش دێتە کایەوە ئەی کورد بۆ نەیتوانی وەک ئەوان خۆی دروست بکات. وەڵامیش ئەوەیە کە ئەو کات هەم مەعریفەی ئیسلامی لە ئاستێکدا بووە کە ئەو نەتەوانە بتوانن بۆ خۆدروستکردن سوودی لێ ببینن، هەم نەتەوەکانیش خۆیان لە ڕووی هۆشیارییەوە لەو ئاستەدا بوون کە بە یارمەتی مەعریفەی ئیسلامی بتوانن خۆیان دروست بکەن. بەڵام کورد ئەو کات لەو ئاستە هۆشیاریەدا نەبوو، ئێستە کە هۆشیاربووەتەوەو هەست بەوە دەکات دەبێ خۆی دروست بکات، مەعریفەی ئیسلامی هەنوکە ئەو توانا و ووزەیەی پێنەماوە کە کورد

وەک هۆکارێکی یارمەتیدەر بەکاری بهێنێت، چونکە نەکورد خۆی و نەتەوەکانی تری ناو ئیسلام ئەو توانایەیان هەیە گۆڕانێکی بنەڕەتی وا بەسەر ئیسلامدا بێنن، تا کورد بتوانێ خۆی پێدروست بکات. دەبێت خوێنەر لەوەش بێگومان بێت کە مەرجیش نیە ئەو نەتەوانەی تر لە - هەست -وە ئینتمای نەتەوەییان بۆ خۆدروستکردن تیا جوڵا بێ، بەڵکو دەشێ -نەست - ئەو ئینتمایەی جوڵاندبێ و ئەو ململانێیەی لەگەڵ عەرەبدا پێ دروستکرد بێ تا ئەو ماڵە جیایە لە ناو ماڵە گەورەکەی ئیسلامدا بۆ خۆیان بخولقێنن. ئەگەر مێژووی ململانێی عەرەب و فارس، عەرەب و تورک بخوێنینەوە ئەوا بە ئاشکرا هەست بەو ئینتماو ماڵ جیایە دەکەین.

هەرچەند ئەمڕۆ لەکوردستانی باشووردا، ئاراستەیەکی ئیسلامی مەیلەو نەتەوەیی دروستبووەو ڕەواجیشی هەیە، وەلێ ئەم ئاراستەیە کاردانەوەیەکی سیاسی ڕووتەو پەیوەندی نیە بە دروستبوونەوەیەکی ڕۆحی و گەڕانەوە بۆ لای خودی مرۆڤی کورد خۆی. چونکە هەموان هەڵگری بیروباوەڕێکن کە گوایە خودای ئەم گەردوونە بە

عەرەبی، ئیسلام ی وەک دوا ئایین بۆ گشت مرۆڤایەتی ناردووەو ئیتر دەسەڵاتی ئەمانی تێدا نیەو ناتوانن بەئاراستەیەکی تردا بیربکەنەوە. کێشەی بنەرەتی کوردی موسڵمان ئەم ترسەیە کە لە پەلوپۆی خستووەو ئیرادەی ئیفلیج کردووە. هەرکاتێ کورد ئەم دۆخە بەستەڵەکە بشکێنێت، ئەوا هەست بەئازادییەک دەکات کە دەتوانێ نەک تەنها عەرەب بەڵکو تورک و فارسیش ناچار بکات ڕێزی لێبگرن ودانی پێدا بنێن، نەک هەر ئەمە، بەڵکو ئەوانیش تێپەڕێنێت و ڕێگە بۆ تورک و فارسیش خۆشکات تا سەربەخۆتر بیرکەنەوە.

ئەو تاکە کوردانەی کە بزاڤی ئیخوان لموسلمینیان هەڵبژاردووە هەست و نەستی ئینتمای نەتەوەییان تێدا نەجوڵاوە. ئەمەش نەک لەبەرئەوەی شانازی بە کوردبوونی خۆیانەوە ناکەن، بەڵکو لەبەرئەوە بووە کە ئەم بزاڤە لە ئیسلامەوە هەڵقوڵاوەو وەڵامی ئەو پرسیارانەیان دەداتەوە کە لەسەر ژیان و مردن بۆیان دروست دەبێ. واتە بزاڤێکی ئاینی خۆڕسک نەبووە تا ناسنامەیەکی کوردانەو ئینتمایەکی نەتەوەیی لێوە

دامەزرێت و جیهانبینیەکی خۆماڵی هەڵقوڵاوی ڕۆحی کوردی لەسەر بونیاد بنرێت و ئیتر کورد هەست بە دوالیزمی ڕەهەندی ئایینی و نەتەوەیی نەکات. هەستکردن بەم دوالیزمە لە نەستەکۆی نەتەوەکانی تردا کە عەرەب نین هێندەی کورد بە زەقی بەدی ناکرێت. چونکە ئەوان خاوەنی وولات و دەستووری خۆیانن، ئەم دوالیزمیە وەک کێشەیەکی ناوخۆیی قسەی لێدەکرێت و هێندە کاریگەری نیە بەسەر داهاتووی دروستبوونیانەوە و ململانێی نەتەوەکانی دراوسێ ناتوانێ دوولەتیان بکات، وەک چۆن کورد دەبێتە دوو بەرەیی جاش و پێشمەرگە. لێرەشدا کە قسە لەسەر ئاینی خۆرسک دەکەم، مەبەستم گەڕانەوە نیە بۆ ئاینی زەردەشت، وەک هەندێک کورد بۆی دەچن، یەکەم لەبەر ئەوەی ئاینەکان گشتیان بۆ ئیمرۆ دەچنە چوارچێوەی ئەفسانەیەکەوە کە بە ئیمڕۆی زانستی ئەزمونگەری ناخۆن، دووەمیش ئێستا باوەڕم وانیە کە زەردەشتی ئاینێکی کوردی بووبێ، چونکە کورد وەک نەتەوەیەک لەوسەروبەندەدا هیچ چەشنە سیمایەکی نەتەوەیی پێوە دیارنەبووەو نەبوبوە

ئەو مەخلوقەی کە سنورێکی نەتەوەیی پێوەدیاربێت، تا هەنوکە بڵێین کورد پەیامبەری خۆی بووە. کە کورد خۆی نەبوبێت، ئیدی چۆن پەیامبەری دەبێت. لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە کە هەنوکە کورد ئامادەگی ئەوەی نەبێت خۆی بۆخۆی بیرکردنەوەی تایبەتی سەبارەت بە خوداو گەردوون هەبێت، چۆن سێ هەزار ساڵ لەمەوپێش ئەو توانا مەعریفیەی بووە تا بتوانێ لە ئاستێکی هوشیاری ئەوتۆدا بێت پەیامبەری تێدا هەڵکەوێت.

مەخابن ئەو کوردانەی کە ڕۆحی ئایینداری جا بە هەر هۆیەوەکەوە بووبێ، بەسەریاندا زاڵە هێندە هۆشیار نەبون تا هاوکێشەکان ئەوا لێکبدەنەوە، ئەمەش لەو ئایدۆلۆژیایەوە هەڵدەقوڵێت کە دەڵێ خودا ئایینی ناردوەو ئاواش ناردوێتی و هەر ئاواش دەبێ بمێنێتەوە. گەر مرۆڤی کورد لەوە هۆشیار بوایە کە خودا وەک ئەو هەناسەیە وایە مرۆڤ بە بەردەوام پێویستی پێیەتی و ناکرێت و ناشێت ئەو هەناسەیە لە کات و ساتێکدا بوەستێنرێت. هەر مرۆڤەو هەر نەتەوەیەک بە گوێرەی ئاست و توانستی خۆی ئەو هەناسەیە

وەردەگرێت و دەداتەوە، ئەڵبەتە ئەو بزاڤە ئایینیە بە ئاراستە و ئاقارێکی تردا دەڕویشت و بێ ئەوەی دژایەتی ئیسلامیشی لێبکەوێتەوە. من پێم وایە موحەمەد کاتی خۆی لەم ئاستە ڕوحیە هۆشیار بووە و ویستویەتی ئایینەکان و نەتەوەکانی تریش بەوە قایل بکات کە خودا دەبێت بۆ هەموو نەتەوەیەک پەیامبەرێکی خۆی هەبێت بۆیە قورئان دەڵێت (وما ارسلنا من رسول الا بلسان قومە لیبین لهم) دیارە ویستویەتی بەم ئایەتە ئەو دۆگما باوە بشکێنێت کە گوایە پەیامبەران لە نێوان یەهودی و مەسیحیەت نابێت دەرچێت. دیارە ئەم بیروباوەڕە کاریگەری بەسەر عەرەبیشەوە هەبووە هەروەک چۆن ئێستا ئەم ئایدیۆلۆژیایە کاریگەری بەسەر کوردیشەوە دیارەو ناتوانێ لە دەرەوەی ئەو بازنەیەوە بیر لە ئاین بکاتەوە. وەلێ لە هەمان کاتیشدا قورئان لە چەند جێگایەکی تردا ئاماژە بەوە دەدات کە ئیسلام ئایینی گشت مرۆڤایەتیەو موحەمەدیش دوایین پەیامبەرە، هەر ئەم ئایەتەو ئەم پەیامە زیاتر لەو ئایەتەی پێشوو جێگیر دەبێ و دەبێتە ئایدۆلۆژیایەک و بە تەواوەتی لە دڵ و گیانی

مرۆڤگەلی عەرەب و کورددا، بەوانەشەوە کە خۆیان لە ئایین بە دوور گرتووە، ڕەگ دادەکوتێ. ئیتر هەموان لەوە بێ هیوا بوون کە دەشێ مرۆڤ بە بەردەوام بتوانێ خۆی لە خودا و ژیان و بوون تێبگات و ناکرێ بۆ هەتا هەتا مرۆڤایەتی چاوەڕێی کەسێک و کتێبێک بێ. ئەو دۆگمایەی کە یەهودیەکان خولقاندبویان و پەیامبەرانیان لە بەنی ئیسرایلدا گیردابوو و موحەمەد توانی بیشکێنێت، مەخابن کورد هێشتا نەگەشتۆتە ئەو ئاستە کە ئەو دۆگمایەی ئیسلام خولقاندویەتی بیشکێنێت. هەر هیچ نەبێ گەر کورد خۆشی لەوە بگات کە ئەوە ئەنجامی کارلێکردنی نێوان مرۆڤ و گەردوونە وا دەکات مرۆڤ وێنایەک بۆ خودا و ژیان و بوون دانێت و لەگەڵ گۆڕان لەو پەیوەندیەدا، وێنای بۆ خودا و بوونیش دەگۆڕێت. واتە مرۆڤ لە ئەنجامی پێویستیە ڕۆحیەکانی و بەرزبوونەوەی ئاستی بیرکردنەوەی، پەیوەندی لەگەڵ خودا دەبەستێ و لە دوای هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر وێنایەک بۆ خودا و مرۆڤ و گەردون و پەیوەندییەکانی نێوانیان و مردن و ژیان دادەتاشێ و لە ئەنجامدا دەستوور و

یاساشی لەسەر دادەمەزرێنێ. ئەگەر مرۆڤی کورد لەمە هۆشیار بوایەتەوە، هەڵبەتە بزاڤێکی ئایینی جیا لە بزاڤی ئیسلامی لە ناو کوردا سەری هەڵدەدا، ئەو کات ڕێبازی نەتەوایەتی و ڕێبازی ئایینی هەردووک گوزارشیان لە ناسنامە و ڕۆحی کورد دەکرد. ئەوەی لێرەدا مەبەستمە ئەوەیە کە مرۆڤی کورد تا هەنووکەش ئەو ئامادەییەی تێدا نیە خۆی بە زمانی خۆی و بە ڕۆحی خۆی، ڕەهەندی ئایینی نەتەوەی کورد تێر بکات. بۆیە کە بزاڤی ئیخوان بە شێوەیەکی مۆدێرنەتر هاتە گۆڕەپانی کوردیەوە، پێشوازی لێکرا، چونکە ئیخوان هەر وەک لە پێشەوەش ئاماژەم پێدا ئەو جیهانبینیەی ئیسلام و لە هەمان کاتدا گوتارێکی سەردەمانەی لەخۆگرتبوو. بوارێکی گونجاوبوو بۆ ئەو تاکانەی ڕەهەندی ئایینی تێیاندا بە هێزترە لەڕەهەندی نەتەوایەتی. بۆیە ئەم بزاڤە مەلاو کوڕە مەلاو شێخ و کوڕە شێخ و هەژارو زەنگین و لە هەموو چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی کوردی لەخۆگرت.

هەروەک چۆن ئیسلام لەڕێگەی نەتەوەی عەرەبەوە بە کورد دەگات، هەرواش ئیخوان

لەرێگەی عەرەبی عێراقەوە بە کورد دەگات. لەبارترین ژینگە بۆ بیری ئیخوان لە سەرەتاوە شاری هەڵەبجەو دەوروبەری بوو. ئەم بزافە لەسەرەتادا لە نێوەند توێژی مەلاو مەلازادەکاندا تەشەنە دەکات و پاشان دادەبەزێتە ناو خەڵکی سادەو بەتایبەتی لاوان. من خۆم یەکێک بووم لەو لاوانەی کە لە پۆلی سێهەمی ناوەندیدا بووم لە ناوچەی هەڵەبجەدا ئیخوانم پێگەییشت و چەند ساڵێک لە تەمەنم پێی سەرقاڵ بووم. هەرگیز نوکولیم لەوە نییە کە ئەو ساتەوەختەی ئەو بیروبۆچونەم پێگەییشت، زۆر خۆشحاڵ بووم. بۆ ماوەی ئەو چەند ساڵەش چێژێکی زۆرم لێوەردەگرت، ئەویش لەبەر ئەوەی لەو سات و وەختەدا گوتاری ئیخوان گوتارێکی ڕۆحی و ڕەوشتی و پەیوەندی خوداو مرۆڤ بوو. هەر مرۆڤێکیش هەتا لەو مەستی و ناهۆشیاریەدا بمێنێتەوە، هەڵبەتە ئامادە نیە دەستبەرداری ئەو خۆشیە ببێت. کە وشەی ناهوشیاری لێرەدا بەکاردەهێنم مەبەستم ئەوەنیە مرۆڤی دیندار ناهوشیارە، بەڵکو مەبەستم لەو ئایدیۆلۆژیایەیە کە

مرۆڤـی موسـڵمان هەسـتی پـێناکات تـا ئاسـتی ڕۆشـنبیری بەرزنەبێتەوە. پاش ئەو ئاستە دەزانی ئەفسانەی لێبووە بە هەقیقەت. بەڵام ئیسلام وەک مەعریفە نـرخ و بـەهای هـەر دەمێنـێت، چـونکە پەیامـێکی هـەلگرتووە هـەروەک گـشت ئـاین و فەلسەفەیکی تـر. بـەلام خۆبەستنەوەی مـرۆڤ بـە کتێبێکەوە یان فەلسەفەیەکەوە، گرفت دەخولقێنێ و دۆگما دادەمەزرێنێت.

هێندەی من ئاگاداربم بزاڤی ئیخوان تـا کۆتـایی هەفتاکانی سەدەی ڕابردووش، هـێندەی گرنگـی بـە تقوسـەکان و جێبەجـێکردنی ڕەوشـتەکان و زیکرکردن و خۆموحاسەبەکردن دەدا، هێندە گوێی بە کـاری سیاسـی نـەدەدا، هـێندەی خـەمی پاراستنی عەقیدەو ناسنامەی ئیسلامی لەم بزاڤەدا بە هێزبوو، هـێندە ئامـانجی دەسـەڵات گرتنەدەسـت لەئارادانەبوو. تەنانـەت بۆئـەوەی فیتنـە نەکەوێتە نێوان مـسوڵمانانەوە، بەگژاچـوون و جـەنگ دژ بـە دەسەڵاتدارانی وڵاتانی عەرەب و ئیسلامی بە حـەرام لە قەڵەم دەدرا. گوتاری نەتەوایەتیش بڤـە و حـەرام بـوو، چـونکە ئـەمان پـێیان وا بـوو نەتەوایـەتی

گوتارێکی ڕۆژئاواییە، تەنانەت پێیان وابوو کەڕۆژئاوا بیری نەتەوایەتی بۆ نانەوەی دووبەرەکی لە نێوان وڵاتانی ئیسلامیدا بەکاردێنێ. جگە لەوەش لەگوتاری ئیسلامیدا مرۆڤەباوەڕدارەکان لەهەموو نەتەوەو ڕەگەزەجیاوازەکان هەروەک قورئانیش ئاماژەی پێدەکات، برای یەکترن. بۆیە ئەوان پێیان وابوو ئەمە تاقە ڕێگەیەکە بۆ لەناوبردنی ڕەگەزپەرستی لە نێوەند مرۆڤەکاندا. دیارە ئەم ئاماژەیە لە قورئاندا بۆ برایەتی و دژایەتی کردنی ڕەگەزپەرستی لەسەربنەمای عەقیدەیەک، واتە گۆڕینی حاڵەتێکی کۆمەڵایەتی کە جیاوازیکردن بوو لەسەر بنەمای بنەماڵەو هۆزو قەبیلەپەرستی بۆ حاڵەتێکیتر لەجیاوازیکردن لەسەربنەمای باوەڕهێنان یان قبوڵکردنی بیروبۆچونێکی نوێ بۆ ئەو سەردەمە کە یەکتاپەرستی بوو، قۆناغێکە لەبەرزکردنەوەی ئاستی هوشیاری مرۆڤ و پێشخستنی کۆمەڵگە. ئەمە ڕاستیەکە نوکولی لێناکرێ. وەلێ لەم سەردەمەدا مرۆڤ خوازیاری بیرکردنەوەیەکی لەوە فراوانترە. واتە جیاوازی

کــردن لــه نــێوەند مرۆڤەکانــدا لەســەر بنــەمای بیروبـاوەڕ ئاسـتێکی نزمـەو دەبـێ قۆنـاغی بـەرزتر ببڕێ. بۆیە جیاوازیکردن لەسەر بنـەمای بیروبـاوەڕ مرۆیانە نیە، بەڵکە هەموو مرۆڤەکان بـرای یـەکترن و مرۆڤ خۆی سـەنتراڵە نـەک بیروبـاوەڕ، نەتـەوە، ڕەگەز یان ڕەنگ. خۆ ئەمـەش مانـای ئـەوە نیـە کـە تایبەتمەندێـتی تـاک، گــروپ، نەتــەوە لەبەرچــاو نەگیرێـت. ئـەو ئەلتەرناتیڤــەی کــە مــن لــە بــری ڕەگەزپەرسـتی دامنـاوە، ڕەگەزناسـیە. ڕەگەزناسـی واتە دەکرێ هەر نەتەوەیەک تایبەتمەندێتی خـۆی و ئەویدیش لەبەرچاو بگرێ. ئەمەش بـە ناسـینی خـود و ناسینی ئەویدی دەبێ.

مەبەستی من لەم ڕوونکردنەوەیـە ئـەوە بـوو کـە ئەگەر خۆت زۆر هۆشیار نەبی، بـە نـاوی برایـەتی و یەکــسانیەوە دەکەویتــە داوی ئەویــدی و هەرچــی تایبەتمەندی خۆت هەیە لەکیس دەدەی. چونکە زۆر ئەسـتەمە هــەموو سەردەمـێک هــەموو مرۆڤــەکان بتوانن وەک یەک لە دەستەواژەی سەردەمی خۆیان بە باشی تێبگەن و جێبەجێی بکـەن. نەتەوەیـەک بـۆ ئـەوەی بتـوانێ لەگـەڵ ئـەوانی دی بـە یەکـسانی و

برایەتی بژی و لە هەمانکاتدا تایبەتمەندی خۆی لەکیس نەدا، واتە ڕەگەزناس بێ و نەبێتە ڕەگەزپەرست، دەبێ هەمیشە لە ئاستێکی هۆشیاری و بێداری و ئەقڵانی بەرزدا بێت. بەهەمان شێوە نەتەوەیەک بیەوێ پەیامی برایەتی و یەکسانی خۆی بەوانی دی ڕاگەیەنێ و لەهەمانکاتیشدا تایبەتمەندیان لەبەرچاو بگرێ، دیسانەوە ئەستەمە. چونکە تاڵێکی زۆر باریک لە نێوان ڕەگەزپەرستی و ڕەگەزناسیدا هەیەو کەچی زۆریش لەیەکدی جیاوازن. ڕەگی ڕەگەزپەرستی بۆ خۆپەرستی و ئەویدی بێنرخکردن دەگەڕێتەوەو ڕەگی ڕەگەزناسیش بۆ خودناسی و ئەوناسی دەگەڕێتەوە.

ئەوەی دەمەوێ ڕوونتر بیڵێم کە مرۆڤی کورد لە باشووری کوردستاندا کاتێک پەیامی بزاڤی ئیخوانیان وەرگرت، وەرگرتنێکی زانستیانە و هۆشیارانە نەبوو، بەڵکو لەسەر بنەمایەکی سۆزداری ڕووت بوو. لێرەدا دیاردەیەک بە نموونە دێنمەوە، ئەویش دیاردەی ناولێنانی منداڵە لەلایەن ئەو خانەوادە کوردانەی کە چووبوونە ناو بزاڤی

ئیخوانەوەو بە ناوی هاوەڵانی موحەمەد بە بیانوی پیرۆزیی و جوانی پەیام و خورەوشتیان ناوی ئەوانیان لێدەنان. دەکرێ مرۆڤ یان نەتەوەیەک بکەوێتە ژێر کاریگەری جوانی پەیامی مرۆڤێک یان نەتەوەیەکی دی و لاساییشی بکاتەوە، زۆرجاریش لەمێژوودا ڕوویداوە، بەڵام کێشەکە لەمەیاندا ئەوەیە کە ئەو مرۆڤە یان ئەو نەتەوەیە جەوهەری پەیامەکەی لە بیرچێتەوەو خۆی خەریک بکات بە لاساییکردنەوەی ناو و جلوبەرگ و ڕووکەش و هەندێ دابونەریتی سادەی ڕۆژانە. لەوەش مەترسیدارتر بەناوی خواو پیرۆزیەوە ئەم کارە ئەنجام بدرێت. ئەم دیاردەی ناو لێنانە تا سەرەتاکانی سالانی نەوەدیش کاری پێدەکرا. تەنانەت من خۆم لەسەر ناونانی منداڵەکەم بەکوردی و ڕیش نەهێشتنەوە، لەلایەن دوو ئەندامی سەرکردایەتی ئیستای پارتێکی ئیسلامیەوە سەرزەنشت کرام. بەبۆچونی یەکێکیان کە من ناوی عبدالرحمان، عبدالله، مصعب و صهیب.. هتد لە منداڵەکەم نەناوە، چۆن لە ڕۆژی دواییدا وەڵامی خوا دەدەمەوە. بێگومان ئێستە ئەم دیاردەیە

بـەرەو کزبـوون دەڕوات و لەوانەشـە هـەر ئـەو بەڕێزانە خۆشیان ئەم بۆچونەیان گۆڕابێت و ڕەنگە نەک هەر ڕیش بەڵکو سمێلیشیان خستبێتە بانی. من لەمەدا لاریەک نابینم چونکە مرۆڤ دەبێ بۆچونی بگۆڕێت. لە هێنانەوەی ئەم نموونەیە مەبەستم گلـەیی و گازنـدە نیـە، بـەڵکو پیاچـونەوەو بیرخستنەوەی واقعیکەو ناکرێ هەروا بەجێی بهێڵین. دیارە مەبەستی سەرەکی منیش لەم نموونەیە، ئەوەیە گەر ئەو مرۆڤە هوشیارنەبێت لەو توخمە پیرۆزگراییەی ئایندارانی جەختی لەسەر دەکەنەوە چۆن بیری ئایین بە ناوی خواوە مرۆڤ ناهۆشیار دەکات.

بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ لـەو قۆناغـە دەربـاز بـێت پێویستی بە هۆشیاریەکی بەرزی مەعریفی زانستی و ئایینیش هەیە. چونکە تێگەیشتنێکی دروست لە ئایین خۆی یارمەتی دەرێکە بۆ هۆشیاربوونەوەو دامەزراندنی پەیوەندییەکی دروست لە نێوان مرۆڤ و خودا دا.

هەر گۆڕانکاریەک لە بزاڤی ئیخواندا لەمیسر یان لەعێراق ڕوویدەدا، کاریگەری لەسەر کورد بەجێدەهێشت. بۆنموونە سەرهەڵدانی بیری سەیدقوتب لە ناو ئیخواندا کاریگەری لەسەر کوردیش دەرخست. بۆچوونەکانی ئەو جۆرێکی تری لە بیرکردنەوە لەناو ئیخواندا وورووژاند کە لەوەپێش جێگەی سەرنجی ئەم بزاڤە نەبوو، وەک بە ناوزەندکردنی کۆمەڵگەو حکومەتەکانی ئەو کاتەی عەرەبی بە جاهیلیەت. ئەمە بووە هۆی دروستکردنی تەنگەژەیەکی توند لەنێوان حکومەتە عەرەبیەکان و ئەندامانی ئەم بزاڤە. تەنانەت لەم دوایەنەدا وایلێکەوتەوە کە سەیدقوتب وەک دروستکەرێکی بیری تیرۆرستی لە ناو بزاڤی ئیسلامیدا لە قەڵەم بدرێ. ئەم بۆچوونە زیاتر لەلایەن ڕۆشنبیرانی کوردەوە پێشوازی لێکرا. هەرچەند من نوکولی لەوە ناکەم کە بۆچوونەکانی سەیدقوتب توندیەکی پێوە بوو لە چاو بۆچوونەکانی حسن بەننا، دامەزرێنەری ئەم بزاڤە، لە هەمانکاتیشدا داوای گۆڕینی حوکمی دەرکرد،

وەلـێ لەگـەڵ ئـەوەدا نـیم کـە ئـەوە ڕاسـتەوخۆ پەیوەندی هەبێ بەم تیرۆرەی کە ئەمڕۆ لە ئارادایە.

لە ناو کوردی باشووردا دوو بەرە لـە نـاو بزاڤـی ئیخوانـدا دروسـت بـوو، بەرەیـەکی تونـدڕەو بەرەیـەکی میانـەڕەو. لـەدوای ڕاپـەڕین ئـەم دوو بەرەیـە لـە بزووتنـەوەی ئیـسلامی و یـەکگرتووی ئیسلامیدا خۆی بینیەوە. ئەوەی ئاشکرایە ئەم دوو بەرەیە لەسـەرەتادا دۆزی کـورد گـرفتی سـەرەکیان نـەبووە. هـەرکات باسـیان لـە نەتەوایـەتی کـرد بـێ، هەوڵیانـداوە وەک کێشەیەکی نەتەوایـەتی لـە نـاو ئیسلامدا شـەرعیەتی بـۆ بدۆزنـەوە. ئەوان هـەرگیز پـەیان بـە بنـەڕەتی کێـشەی کـورد لـە ڕووی زانـستیەوە، نـەبردووە. تـا ئێـستەش لای ئـەم دوو بەرەیە ئەوە چەسپاوە کە خودا دواهـەمین ئـایین و دواهـەمین پەیامبـەرو دواهـەمین کتـێبی نـاردووە، ئیدی مرۆڤ بۆی نیە لە دەرەوەی ئەو چوارچێوەیە لە کێشەکانی مرۆڤ بڕوانێ. ئەوان بۆ شـەرعیەتدان بە کێشەی کورد پێشوەخت بۆ قورئان دەگەڕێنەوە وەک سەرچاوەیەکی شەرعی، تا بتوانن قسە لەسـەر نەتەوایەتی بکەن. ئیتر زانـست و فەلـسەفەی ئـەمڕۆ

چی دەڵێن لای ئەوان گرنگ نیە یان هەر لێی بێ ئاگان. ئەو لێکۆڵینەوە و تیۆریانەی قسە لەسەر نەتەوەو نەتەوەبوون دەکەن و زانست و فەلسەفە لەم بارەیەوە چی دەڵێت، بۆ ئەوان نەبۆتە کێشە. ئەوەی لای ئەوان کێشەیە ئەوەیە ئایا خودا ڕێگەی داوە کە موسڵمان باسی نەتەوایەتی بکات؟ پاش ئەم پرسیارە ئیدی ئایەت و فەرموودەی زۆرو زەبەندە دەهێننەوە، تا بیسەلمێنن بەڵێ کورد بۆی هەیە باسی نەتەوایەتی بکات. گەر بەڵگەی شەرعی نەدۆزێتەوە ئیدی کوردایەتیکردن حەرامە. پرسیارەکە لەوەدایە، گەر بڵێیت ئیسلام پەیوەندی بە نەتەوەو کەلتوری عەرەبەوە هەیە، ئەم جۆرە کورد پەروەرە ئیسلامیانە دەچن بە ئاسماندا، بەڵام بۆ نەتەوەیەکیتر کەشەرعیەتی نەتەوایەتی کردنی لێوەرگرن، دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو قورئانەی کە خۆی پەیوەندی بە هیچ نەتەوەیەکەوە نیە. بانێکەو دووهەوا!. ئەم پرسیارەم قسەی زۆرتر هەڵدەگرێت ئەگەر بەوردی بە دوایدا بچین، بەڵام هەر بۆ نمونە هێندە بەسە. ئەوان لە نمونەکانیاندا ئایەتی (شعوبا و قبائل) دەهێننەوە، وەلێ ئەو ئایەتانەی کە

تایبەتمەندیتی عەرەبیتی لەخۆگرتووە لە ئاستیا چاوو گوێی خۆیان دادەخەن. قورئان خۆی بە ئاشکرا دەڵێت من پەیامێکی عەرەبیم، کەچی ئەم ئیسلامیانە دەڵێن نەخێر تۆ هەر بۆ عەرەب نیت، بۆ گشت مرۆڤیت. ئەمەش ئەوە ناگەیێنێت کە لە قورئاندا هیچ جۆرە ئاماژەیەکی تێدا نەبێت بۆ جیهانبینی، بەڵێ لەو ئاگادارین، وەلێ چ پەیامێکی مەعریفی لە مێژوودا بووە ئەم دوو ڕەهەندەی واتە لۆکاڵی و جیهانی، کەلتوری و مرۆیی لەخۆی نەگرتبێت. ئەو ئایەتانەی کە لۆکاڵێتی قورئان دەردەخات زۆرن، بەڵام لە هەموویان گرنگتر ئەو ئایەتانەن کە بە ئاشکرا وشەی عەرەب وەک نەتەوەو زمان بەکاردێنێت. وەک: (لسان عربی) بڕوانە سورەتی (النحل ١٠٣، الشعراء ١٩٥) قورئانی عەرەبی بڕوانە( یوسف ٢، طه ١١٣، زمر ٢٨، فصلت ٣، شوری ٧، زخرف ٣)، لەم ئایەتانەدا دەشێ ئەو تەئویلە بکرێت کە خودا دەبێت هەر بەزمانێک پەیامەکەی بنێرێت، وەلێ لەم ئایەتەی تردا (رعد ٣٧) کە قورئان دەڵێت: (خودا حوکمی عەرەبی ناردووە)، ئیدی هیچ بواری تەئویل نامێنێتەوە،

چونکە حوکمی خودا نابێت حوکمێکی عەرەبی بێت، دەبێت بێ ڕەگەز بێت، چونکە خودا بێ ڕەگەزە.

## ئاشنابوونەوە بە خود

عەقیدەو ئایدۆلۆژیای لەو جۆرەی کەباسمانکرد مرۆڤ لە خۆی نامۆ دەکات. لەوێشەوە سەر بۆ ئەوە دەکێشێت کە نەتەوەیەک توشی نامۆیی ببێت. بەڵام کێشەی گەورە لەوێدایە هەروەک چۆن ڕێبازە ئایینیەکان کوردیان بە خۆی نامۆ کردوە، ڕێبازە نەتەوەییەکانیش کوردیان لە خودی خۆی نامۆ کردوە. ئاشنابوونەوە بە خود و نامۆ بوون لە خود چیە؟

ئاشتبونەوە لەگەڵ خود و ئاشنابوونەوە بە خودیش پرۆسەیەکی سایکۆلۆژی ڕوحیە. دیارە لەوەش ئاگادارم کە ئاشنا بوونەوە بەخود کارێکی هەروا سادە و سانا نیە کە جەماوەرێک یان تاکەکانی گەلێک بتوانن دەرک بە پێویستی ئەو پرۆسەیە بکەن یان بتوانن جێبەجێی بکەن. خۆ ئەگەر پێشەنگی ئەو کۆمەڵگایە یا ڕۆشنبیرانی ڕێبازێک یان سەرکردەیەک، لەو حاڵەتە

سـايكۆلۆژيە هۆشيارئيتەوەو لـەخودى خۆيـدا جێبەجێكات، ئەوا كاريگەرى ئەو پرۆسەيە ووردە ووردە لـە نـاو جـەماوەردا تەشـەنە دەكـات. كـاتێ ئەوان لە خودى خۆياندا ئەو پرۆسـەى ئاشـنابوونە بـەخود جێبەجـێى ئەكـەن، جـەماوەريش دەبـێتە چاولێكەريان.

هـەروەک ئاشـنابوونەوە بـەخود پرۆسـەيەكى سايكۆلۆژى و رۆحيە، هـەروا نـامۆبوون لـە خـود و نـامۆبوون بـە خـوديش پرۆسـەيەكى سـايكۆلۆژى و رۆحيــە. لــەو رۆژەوەى مــرۆڤ دێــتە دنيــاوە بەشێوەيەكى زۆر بێدەنگ و خشكەيى و لەسـەرخۆ ئـەو پرۆسـەيە دەسـت پـێدەكات. هـەر لـەو رۆژەوە مرۆڤ پێويستى بە كۆمەڵێک پرۆسەى كۆمەلايەتى و كەلتورى و دابونەريت و گوتار هـەيە، بـەردەوامى و دوبارەبونـەوە و چەسـپاندنى ئـەو دابونـەريت و كەلتورانە بـە درێـژايى مـێژوو وا لـە مـرۆڤ دەكـەن لەسـەريان رابـێت و بـێ لـێپرسينەوە جێبەجـێيان بكـات. ئـەم پرۆسـەيە پـێيدەوترێ پرۆسـەى بـە كۆمەلايـەتيكردن. پرۆسـەى بەكۆمەلايـەتى بـوون مرۆڤ لە خودى خۆى بيردەباتـەوە كـە ئـەو كـێيە و

چی دەوێ، بەمەش ئەوترێ نامۆ بوون لەخود. ئەمە ئەو مانایە ناگەیێنێت کە مرۆڤ لە دەرەوەی کۆمەڵگە بژی لە پێناوی ئەوەی خودهوشیار بێ و نامۆ نەبێت، نەخێر، گرنگ ئەوەیە یەکەم هوشیار بێت لەم کاریگەرییە و دووەم لە هەموو ئان و ساتێکدا ئامادە بێت بۆ گۆرانکاری گەر پێویست بێت.

پرۆسەی بە کۆمەڵایەتیکردن چیرۆکێک بۆ ژیان دەهۆنێتەوە، ئەو چیرۆکە لە مرۆڤ دەبێتە هەقیقەتی رەهاو ژیان و مان و نەمانی خۆی لەسەر بونیاد دەنێ. هەرکاتێ مرۆڤ بەپرۆسەی پێ بە پێی هۆشیاربوونەوە، بە ئاسۆی رۆشنگەریدا سەردەکەوێت، دەتوانێت لە ژێر باری ئەو چیرۆکە دەرچێت و ئازادی وەرگرێتەوە و بکەوێتە حاڵەتی بە تاک بوونەوە. لێرەوە جارێکیتر ئەم مرۆڤە ژیان و مان و نەمانی خۆی بۆ خۆی دەهۆنێتەوە و لە وێدا هەستی نامۆبوون تێدەپەڕێنێت و بە خودی خۆی ئاشنا دەبێتەوە. هەرکاتێ ئەم مرۆڤە بتوانێ پرۆژەیەکی وا دامەزرێنێت کە کۆمەڵگەکەی لە رۆحی خۆی تێ بگەیەنێت و بتوانێ ئەگەر بە

لاساییکردنەوەش بێت فێری جێبەجێ کردنیان بکات ئـەوا پتـەوی و یـەکڕیزی لـە نـاو کۆمـەڵگادا دەخولقێنـێت و ناسـنامەیەک دروسـت دەبـێ کـە جیهـانبینی و ئینتمـا بـۆ یەکـدی، ئـایین و نەتـەوە پێکەوە گرێدەدات و لەگەڵ نەتەوەکانی تردا نەک ململانێیەکی سیاسی و دەسەڵات، بەڵکو ململانێیەکی مـەعریفی دەخولقێنـێت. ئێمەی کـورد ئـەم جـۆرە پرۆژەیـەمان نـە لـە بزاڤـی ئـایینی و نـە لـە بزاڤـی نەتەوایـەتی نـەدی. بـەڵکو هەریەکـە و بـە ئاراسـتەی جێبەجـێکردنی مـەرامی پارتایـەتی خۆیـان یـان مـەرامی تایبـەتی دەچـێت. نـەبوونی پرۆژەیـەکی وا لەناو کوردا دەگەڕێتەوە بـۆ نـەزانی و ناهۆشـیاری. نـەزانی لـەوەوە سەرچـاوە دەگـرێ کـە لای ئـێمە هەمیشەو تا هەنوکەش ڕەهەندی ئایینی و ڕەهەندی نەتەوایـەتی لـە مرۆڤـدا بـە جیـا سـەیرکراوە. جگـە لەوەی کە ئایین لای ئێمە هێشتا هەر لـە سـتراکتۆرە تەقلیدیەکەیدایـەو نەچـوتە سـتراکتۆرە مۆدێـرن و پۆستمۆدێرنەکەی.

بۆیـە دەبیـنین بزاڤـی ئیـسلامی سیاسـی لـە گۆڕەپـانی کوردسـتاندا پـاش ڕاپـەڕین هیچـێک لـە

ڕەفتارو سیستەمی حیزبایەتی و دروشمەکانیاندا، جیاوازییەکی نەبوو لەگەل بزاڤی نەتەوایەتی ناو کورد. بۆ نموونە یەکگرتووی ئیسلامی هەمان دروشمی کەرکوکچێتی دەڵێتەوە کە پارتی و یەکێتی بازرگانی پێوە دەکەن. ئەمە ئەگەر بە هەڵەدا نەچوو بم، لە دروشمی سیانزەمین ساڵیادی دامەزراندنی یەکگرتوودا بینیم، کە دەڵێ: کوردستان بێ کەرکوک ناتەواوە. ئەمە ڕێک دووبارەکردنەوەی (کەرکوک دڵی کوردستانە، کەرکوک قودسی کوردستانە)یە. کە ئەمڕۆش ئیسلامیەکان گوتاریان بە ئاراستەی کوردایەتیدا ئەبەن، هەر جوینەوەی هەمان وشەو دروشمەکانی پارتی و یەکێتیە. ئیسلامی سیاسی شەرعیەتی بوونی پارتی و یەکێتی پتەوتر و توندو تۆڵتر کردەوە، لەوکاتەی پەیامبەرێکی وەک موحەمەد دۆگمای سەرۆک خێڵ و عەشرەتەکانی عەرەبی دەشکێنێت، کەچی ئیسلامی سیاسی کورد نەیتوانی ئەو دۆگمایە بشکێنێت کە ئەوان خۆیان لەسەر ڕاگرتووە، بەپێچەوانەوە پتەوتری کردەوە. ئەو هێزو تینەی موحەمەد هەستی پێدەکرد لەوەوە بوو کە ئەو

لــــەخودی خۆیـــــدا پەیامـــــێکی ســـــازکردبوو، لەنەتەوەیـــەکی دی وەرینـــەگرتبوو. هـــەر بـــەوەش شەرمەزاری دەکردن ئایا ئەم قورئانە عـەرەبی نیـە، ئـــەی بـــۆ تـــێناگەن. کەچـــی ئـــەم حاڵەتـــە لای ئیسلامیەکانی کورد پێچەوانەبۆتەوە، لەبری بوێری، شەرمندەی کردوون. ئیسلامیەکانی کورد شەرمێکی بێدەنگ لە ئاست پارتی و یەکێتی دایگرتوون لەمـەر کێـشەی نەتەوایـەتی کـوردا، چـونکە ئـەوان بـەوە تاوانبـارکراون هـــەڵگری ئایـدیۆلۆژیای عــەرەبن و ئەوانیش مل بۆ زۆر شت کەچ دەکەن تا ئەم لەکەیـە لـەخۆیان بکەنـەوە. کێشەی بنـەڕەتی مرۆڤـی کـورد ئـــازادکردنی ڕۆحیـــــەتی و ڕاهـــێنانیەتی لەســــەر خۆگرتنـــەوە لـــە ئاســـت غـــەریزەی دەســـەڵات و دامەزراندنی پرۆژەیەکی ئەوتۆی عیرفانی تا بتوانێ هەوێنێک بۆ شیری ئەمەییوی کورد بخولقێنێت.

هەرچــەندە ئێـستا بـازاڕی بزاڤـی ئیـسلامی لــە کوردستانی باشووردا گەرمە، بـەڵام پێدەچێ هـەمان ئاکـامی بـازاڕ کـزی ئێـستەی مارکـسیزمی بەسـەردا بـێت . چـونکە مـێژووی جیهـانی ئیـسلامی هـەرسـێ بزاڤەکـەی کـە لـە پێشەوە ئاماژەمـان پێدا بـەخۆوە

دی. بزاڤی ئیسلامی کۆتایی بەو مێژووە دەهێنێت بێ ئەوەی جیهانی ئیسلامی گۆڕانێکی جەوهەری بەخۆیەوە ببینێت. نە بزاڤی نەتەوەیی و نەبزاڤی مارکسی و نە بزاڤی ئیسلامیش ئەو توانستەیان نیە دیموکراسی جێبەجێ بکەن. چونکە دیموکراتخواز نابێت ڕەهاخواز بێت. دیموکراتی بوون، واتە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لەو کۆمەڵگەیەدا. گۆڕانکاری بنەڕەتی، واتە دەسکاریکردنی هەست و نەستی تاک و نەستەکۆی کۆمەڵگە. بەواتایەکی تر دەسکاریکردنی ڕۆحی مرۆڤە. ئەو مرۆڤەی سەدان ساڵە بگرە هەزاران ساڵە ئایدیۆلۆژیایەک یان چەند ئایدۆلۆژیایەک دروستی دەکات.

لەمەودوا هەوڵ دەدەین ئەوە ڕوونکەینەوە بۆ بەم باوەڕەی هەنوکەی ئیسلام ناتوانین دیموکراسی بین!

### جیهانی ئیسلامی و دیموکراسیبوون[9]

ئەم پەرەگرافە بەم پرسیارە دەستپێدەکەین: ئایا دیموکراسیبوون هوشیاربونەوەیەکی جۆرەکی دەخوازێت یان هەروا لەخۆرا و بە دروشم و گوتار

بەرێدە چـــــــێت؟ ئایـــــا دیموکراســـــــیبوون بەدەسکاریکردنی تـەنها فـۆرم دروسـت دەبـێت یـان سـترەکتوری تــاک و کۆمەڵگــەش دەبــێ ســەروبن بکرێت؟

دیموکراسی بەتـەنها سیستەمـێکی سیاسـی نیـە و ڕەهەنـــدەکانی تـــری ژیـــان وەلانــێت، نەخـــێر؛ دیموکراســی سیستەمــێکە ســەرتاپای ڕەهەنــدەکای تــری ژیــان دەگرێــتەوە، وەک لایــەنی ئــابوری کــە بازاری ئازاد دەخوازێت، وەک تاک کە بـەهای خـۆی لــە ئاسـت کۆمەڵـدا وەرگرێـتەوە، وەک خــێزان کــە باوکسالاری یان دایکسالاری سەروەری وەرنەگرێت، مـرۆڤ وەک مـرۆڤ نرخـی خـۆی هەبـێت و گـشت مرۆڤێک بە سەرکردەو جەماوەرەوە لە هەمبەر ئەو بەهایــەدا یەکــسان بــن، لـــە هـــەمووی گرنگتـــر یەکسانبوونی عەقیدەکانـە لـە ئاسـت یەکدیـدا، واتـە دەســهەڵگرتنە لــە ڕەهــایی عەقیدەیــەک. ئــەم دوا ڕەهەندەیان بۆ ئێمە تا بڵێی گرنگـە قـسەی خۆمـانی لەسـەر بکـەین. چـونکە گـرفتی جیهـانی ئیـسلامی وا لەم خاڵەدا و هەستی پێناکرێت.

لێرەدا هەوڵدەدەین بەرێگەی دەروونشیکاری بچینە ناخی موسڵمانێکەوە. ئەو موسڵمانەی هەڵگری عەقیدەیەکە کە پێیوایە خودا ڕاستەوخۆ پەیامی خۆی بۆ ناردووە. پرسیارەکەی ئێمە لێرەدا ئەوەیە: ئایا ئەم عەقیدەیە لەگەڵ دیموکراتیدا دەگونجێت؟ بێگومانم لەوەی کە وتار و کتێبی زۆروزەبەن لەوبارەوە نوسراون کە ئیسلام دژ بە دیموکراتی نیە و ڕەنگە لە هەندێ شوێنیشدا وا بێت وەک موسڵمانەکان دەیڵێن، چونکە ئەو نوسینانە قسەیان لەسەر یاسا و دەستورەکانی ناو مێژووی ئیسلامە. بێگومانیشم لەوەی گەر بە مێژووی ئیسلامدا بگەڕێیت، نمونەی دیموکراتیش و نمونەی دیکتاتۆریش دەدۆزیتەوە. وەلێ گرفتەکە لەوەدایە کە ئیسلامیەکان نمونە جوانەکانی مێژووی ئیسلام دەخەنەروو و ناحەزانی ئیسلامیش نمونە دزێوەکانی مێژووی ئیسلام دەدۆزنەوە. ئەگەر مێژوو، مێژووی مرۆڤ بێت، هەڵبەتە لە هەردوو نمونەی دزێوی و جوانیش دەتوانرێ ببینرێتەوە. مێژووی شارستانی هیچ کۆمەڵگەیەک بەدەر نیە لەم ڕێسایە، بەم شارستانیەتەیشەوە کە هەنوکە

ڕۆژئـاوا خاوەنیـەتی. بەهـەمان شـێوە دەتـوانین نمونەی جوانی دیموکراتی لە ئاینـەکانی تریـشدا لـە ساتێک لە ساتەکانی مێژوودا یان لە تێکستێک لە ناو کتێبە پیرۆزەکانیانـدا بەدیبکـەین. هـەر بۆنمونـە لـە وتارێکی بودادا بۆ قوتابیەکانی جوانترین گوزارشی دیموکراسی تێدا یە کە لەگەڵ سیستەمی دیموکراسی ئیمـرۆدا پـێکدێتەوە، هـەروەک دەتـوانین بڵـێین حوکمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز گەر بەراوردی بکەیت لەگەڵ خەلیفـەکانی پێش ئـەودا سیستەمێکی جـوان بـوو بـۆ ئـەوکات. وەلـێ ئـەم دیموکراسـیەی ئیمرۆی ڕۆژئاوا توخمی زۆری تێدایە کە لە دوێنـێدا بــەدی ناکرێــن. دیموکراســی هەنوکــەی ڕۆژئــاوا بەتـەنها سیاسـەتی حـوکمکردن ناگرێـتەوە، بـەڵکو ناخی تاک و عەقیدەی کۆمەڵگەشی گرتۆتـەوە، هـەر دەسـکاری سیـستەمی کۆمەڵگـەی نـەکردووە، بـەڵکو دەسکاری سایکۆلۆژیای تاکیشی کردووە.

لەم وتارەدا قسە لەسەر مێژووی ئیسلام ناکـەم، بەڵکو قسە لەسەر ئەو مرۆڤە دەکەم کە ئەم مێژووە خولقاندویـەتی. قـسەی مـن لـە سـەر کتـێب و ڕوداوەکـانی نـاو مـێژووی ئیـسلام نیـە تـا بەشوێـن

نمونەی جوان یان دزێودا بگەڕێم، قسەی من لە سەر دەستورو یاساکانی ئیسلام نیە تا ڕایبگەیێنم ئەم دەستورە یان ئەو یاسایە بۆ ئیمرۆ دەگونجێت یان ناگونجێت، قسەی من لەسەر شتەکان و ڕوداوەکان نییە کە بەسەرچوون، بەڵکو قسەی من لەسەر خودی ئەو مرۆڤەیە کە ئیمرۆ خۆی بە موسڵمان دەناسێت. ئەو مرۆڤەی مێژوویەکی هەزاران سالە لە پێکهاتنی کاراکتەریدا دەستی هەیە. قسەم لەسەر موسڵمانی ئیمرۆیە نەک موسڵمانی دوێنێ، قسەم لە سەر ئەو مرۆڤەیە کە کتێبەکانی پێشوو و ڕوداوەکانی پێشوو وتارەکانی پێشوو لە دروستکردنیدا دەستیان هەبووە.

لەم پرۆسەیەدا مرۆڤێک خولقاوە، پێکهاتەیەکی عەقڵی و دەروونی وای بۆ ڕەخساوە، نەستێکی ئەوتۆی بۆ دامەزراوە لەگەڵ دیموکراسی ئیمرۆزدا گونجاندنی سەختە. مانای ئەوەنیە هەوڵی گونجاندن نەدراوە، چونکە ئیسلامیەکان دەتوانن نمونەی زۆر و زەبەندی ئەو وڵاتانە بێننەوە کە ئیسلامی حوکم دەکاو دیموکراسیش پیادە دەکرێت، هەڵبەتە مەبەستی منیش هەر ئەمە نیە، بەڵکو

مەبەستم ناخی ئەو مرۆڤەیە کە دیموکراسیبوونەکەی لە سەنگی مەحەک بدرێت. ئایا دیموکراسی هەرتەنها هەڵبژاردنە و بوونی پارتی جۆراوجۆرە وەک لە تورکیادا بەتایبەتی دەیبینین؟ نا، نەخێر دەمەوێ ئەوە روونکەمەوە ئەو تاکە تا چەند ئەخلاقی دیموکراسی لە ناخی خۆیدا هەڵگرتوە. دەنا ئەمەش هەروەک ئەو باوەڕ بەخوابوونەی لێدێتەوە کە دەڵێ باوەرم بە خودایە، وەلێ تا چەند توخمی بە خوابوونی لەناخی خۆیدا هەڵگرتووە. واقع یان روداوێک ئەو ناخەمان بۆ دەردەخات تا چ ڕادەیەک ئەو مرۆڤە لە گەڵ باوەڕەکەیدا ڕاستگۆیە. هەر بۆنمونە دەسەلاتدارانی تورک بە ئیسلامی و بە عیلمانیەوە تا چ ئاستێک دەتوانن دیموکراسی بن لە ئاست دۆزی کوردا. وەلامدانەوەی دەسەلاتی تورکی بۆ ئەم کێشە واقیعیە ڕادەی باوەری ئەوان بە دیموکراسی دەردەخات. پرسیارێکی دی ئەوەیە بۆ مافی کورد لای دەسەلاتدارانی خۆرئاوا هێندە ئالۆز نیە و بە مافێکی ئاسایی دەزانن، کەچی تورک و عەرەب و فارس بە مافی ڕەوای نازانن؟ هەروەک

ڕاستێتی ئیمان کردەوە دەری دەخات، ئاوهاش ڕاستێتی دیموکراسیبوون کردار دەریدەخات.

ئەو ناخەی موسڵمان هەڵگریەتی گەر وەرچەرخانێکی جۆرەکی تیادا ڕوونەدات، دامەزراندنی سیستەمێکی دیموکراتی تا بڵێی ستەمە و سەختە. وەرچەرخانێکی جۆرەکی لە بیرکردنەوە، وەرچەرخانێکی جۆرەکی لە عەقیدە، وەرچەرخانێکی جۆرەکی لە وێناکردنی مرۆڤ، وەرچەرخانێکی جۆرەکی و سەرەکی لە چەمکی خوایەتی. چەمکی خوایەتی هەرکۆمەڵگەیەک ئاوێنەی ناخی ئەو کۆمەڵگەیە نیشان دەدات. هەرکەسێک ئاگاداری سایکۆلۆژیای ئاین بێت یان ئاگاداری سۆفیگەری بێت لەم مەبەستەم چاک تێدەگات. بەتایبەتی لە ڕێبازە سۆفیگەریەکەی فەریدەدینی عەتتاردا ئەو پەیوەندیەی نێوان چەمکی خوایەتی و ناخی یا نەستی مرۆڤ بە ئاشکرا دەردەکەوێت. کە دەڵێم موسڵمان هەرتەنها ئیسلامیەکان ناگرێتەوە، بەڵکو ئەوانەشی کە خۆیان بە پارتی عیلمانی دەزانن، دەگرێتەوە. لەبەرئەوەی ئەوانیش لەو کەلتورەدا گەورەبوون و هەمان

هەوایان هەڵمژیوە. بۆ راستیتی ئەم بۆچونەم چەند مانگێک لەمەوپێش لەگەڵ چەند کەسێک کە مێژوویەکی درێژیان لەگەڵ کۆمەڵەی رەنجدەران بووە، کە بۆچونی خۆمم لە هەمەبەر ئیسلام ئاشکرا کرد و پێشنیاری ئەوەم کرد کە کورد تا رۆحی خۆی سەربەخۆ نەکات ناتوانێت سەربەخۆیی خاک و ولاتیشی دەسکەوێت، زۆربەی ئەو بەرێزانە ترسێکیان لێنیشت. ئەو ترسە بردنیەوە دۆخی نەستی خۆیان کە چەندین ساڵە مێژووی ئیسلام دایدەرپێژێت. من هەوڵم دەدا ئاین لە ئاستێکی بەرزتر لەوەی ئیسلام روونکەمەوەو لەم سەردەمی پۆستمۆدەرنەیەدا چۆن ئاینخوازبین، کەچی ئەو بەرێزانە بەرگریان لە ئیسلام دەکرد، کە لەوانەیە هەندێکیان لە ژیانیاندا بۆ جارێکیش رکعاتێک نوێژیان نەکردبێت. خۆشم زۆرچاک لەوە هوشیارم کە ئەم خواستەی من تا بڵێی بۆ کۆمەڵگەی کوردەواری سەختە و هەرس ناکرێ، وەلێ دەبێ ئێمەش لەوە هوشیاربین کە کاری سەخت مرۆڤ فێردەکات و گەشەی پێدەدات، هەر مرۆڤی هوشیاریش چاکتر لە خواستەکانی خوا تێدەگات،

ئیدی دەبێ ئەم هوشیاربونەوەیە چ پێچەوانەیەکی ویستی خوای تێدابێت. هەڵبەتە لێرەدا مەبەستم لایەنی مەعریفەی ئیسلام نیە کە وەک ئەبستمۆلۆژیایەک ویناى ژیانێکی میسالی بۆ مرۆڤ دەکێشێت، هیچ کاتێک لاریم لەم مەعریفەیە نەبووە تا هەنوکەش ئەم مەعریفەیەی ئیسلام سەرقالی کردووم، مەبەستم ئەو ئیسلامە ئیدۆلۆژیەیە کە تێکەڵ بەکەلتوری کۆمەڵگە بووەو بە ناوی خوداوە دەخرێتە ڕوو. گشت ئاینێک دوو ڕەهەندی ڕۆحی و کەلتوری لە خۆ گرتووە. هەرچەندە ئەو ڕەهەندە ڕۆحیەش لە ئاینێکەوە بۆ ئاینێک و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێک و لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەک دەگۆڕێت، بەلاّم گشتیان رووی مرۆڤ ئاراستەی ئەو ڕەهەندە شاراوەیە دەکەن و بەرەو هوشیاربونەوەیەکی تایبەتی دەبەن. هەزاران ساڵ ئاشنا بوون بە یەک ئایدیۆلۆژیا، سانا نیە وەرچەرخانی رووگەی ئەو مرۆڤە بەرەو جۆراوجۆربوونی ئایدیۆلۆژەکان.

ئەوا نزیکەی هەزاروچوارسەد ساڵە پەیتا پەیتاو نەوە بەنەوە ئەو ئایدیۆلۆژیایە بە گوێی موسڵماندا

دەدرێت، کە ئەو خاوەنی دوا پەیامی خوایە، شوێنکەوتووی دوا پەیامبەرە و هەڵگری هەقیقەتی ڕەهایە. مرۆڤێک کە هەڵگری عەقیدەیەکی وەهابێت، چۆن ڕازی دەبێت بچێتە ڕیزی مرۆڤێکی دی کە هەڵگری عەقیدەیەکی دی بێت. ئالێرەدایە ناکۆکی ڕاستەقینە و جەوهەری لە نێوان دیموکراسیبوون و موسڵمانبوون. خۆ ئەگەر موسڵمان بەوە ڕازی بێت کە عەقیدەکەی لە ئاست عەقیدەی ئەوانی دیدایە هەڵبەتە ئەوە ئەو وەرچەرخانە جۆرەکیەیە کە من مەبەستمە. ئیدی ئیسلام دەتوانێ ئەو ئیسلامە بێت کە هەنوکە موسڵمانان شانازی پێوەدەکەن؟ چونکە دیموکراسیبوون یانی تاکگەرایی، ڕێژەگەرایی، جا چ لە سیستەمی بیرکردنەوەدا بێت یان لە سیستەمی حوکمدا بێت. لەم سیستەمەدا چەمکی خوایەتی کە تاقە پەیامێکی بە ڕێگای گەلێکی تایبەتەوە ناردبێت کۆتایی پێدێت. ئایا موسڵمان بەرگەی ئەم وەرچەرخانە دەگرێت؟ ئەم وەرچەرخانە لە ڕۆژئاوادا نزیکەی چوارسەدەی خایاندووە، داخۆ لە وڵاتانی ئیسلامیدا چەند دەخایەنێت؟ خۆ ئەگەر

دەشڵێن ئیسلام لە مەسیحی جیاوازە، ئەوەش مافێکە موسڵمان بۆی هەیە وەریگرێت، وەلێ پێویست ناکات بانگەوازی دیموکراسیەت بکەن، هەق وایە باس لە چۆنیەتی تەتبیقی شەریعەت بکەن و بیسەلمێنن کە لە دیموکراتیەت باشترە بۆ ئیمرۆی مرۆڤایەتی.

ئیدی موسڵمان یان جیهانی ئیسلامی یان تاکەکانی وڵاتانی ئیسلامی بە موسڵمان و نا موسڵمانەوە دوو ڕێگەی لەبەردەمدا دەمێنێتەوە، یان ئەوەتا بڵێت، بەڵێ گشت ڕێباز و ئاین و فیکرەکانی دیش هی خودان و پەیامی خودایان لەخۆ گرتووە، واتە گشت شتێک و دیاردەیەک خوداییە (پیرۆزن)، یان ئەوەتا باوەر بەوە بێنن کە گشت شتەکان مرۆڤ خۆی بۆیان تێدەکۆشێت و پێیدەگەن و بۆ خودا گشتیان وەک یەکن و شتەکان یان دیاردەکان گشتیان ناخودان (ئاسایین). لەیەکێک لەم دوو دۆخەدا نەبێت، مرۆڤەکان ناتوانن بگەنە ئاستێک تا بتوانن باوەڕ بە دیموکراسی بێنن و لە ژیانی ڕۆژانەدا ڕەنگ بداتەوە.

# بەشی سێیەم

## ڕۆحی کورد لەبن دەستی مارکسیزم دا

لە لاپەڕەکانی پێشودا ئاماژەم بەوەدا کە جیهانی عەرەبی لەدەرئەنجامی شۆکی ئیمپریالیزم و لە هەمان کاتدا بیری پێشکەوتو و بالآدەستی ڕۆژئاوا، سێ جۆر تەوژمی تێدا پەیدا بوو: تەوژمی نەتەوەیی و تەوژمی ئیسلامی سیاسی و شانبەشانی ئەم دوو تەوژمەش تەوژمێکی تر کە بیریی مارکس ڕابەرایەتی دەکرد، هاتە ناو گۆرەپانی کۆمەڵگەی ئیسلامییەوە. لەم بەشەشدا هەوڵ دەدەین کورتە باسێکی مێژووی بیری مارکسیزم و چۆنیەتی کاریگەری لەسەر کۆمەڵگەی کوردی باشوور بخوێنینەوە. بە پێویستی دەزانم لێرەدا کورتەیەک لەمێژووی سەرهەڵدانی بیری فەلسەفەی مارکس بخەمە ڕوو:

فەلسەفەی مارکس لەو هەستەوە سەرچاوە دەگرێ کە گوایە سیستەمی سەرمایەداری

لەوسەردەمەدا لەگەڵ ڕۆحی مرۆڤایەتیدا ناگونجێت و ڕۆحی مرۆڤ وێران دەكات و لەبەردەم گەشەكردن و پەرەپێدانی توانا شاراوەكانی زۆربەی مرۆڤگەلی ئەو كۆمەڵگەیە ڕێگر دەبێ. ماركس لەم كەلەبەر و كەلێنەوە جارێكی تر لە كۆمەڵگەی ڕۆژئاوا دەڕوانێت و دەیەوێت هۆ و فاكتەرەكانی دیاری بكات بۆ ئەوەی لەوە تێبگات، بۆچی ئەو كۆمەڵگەیەی ئەوی تێدایە وا ڕۆحی تاكەكانی شپرزەبوون. لەوێوە ڕەخنە لەو سەرچاوانە دەگرێت كە بوونەتە هۆكاری دامەزراندن و بەردەوامیدان بەو سیستەمە سەرمایەداریە. ئەو دوو سەرچاوەیەش كە ئەو دەیانخاتە ژێر ڕەخنەوە ئایین و فەلسەفەیە. ئایین بە هۆشبەری كۆمەڵگە و فەلسەفەی ئایدیالیزمی پێش خۆیشی بە پاڵپشتی ئەو هۆشبەرە دادەنێت. بۆ هەڵوەشاندنەوەی ستروكتوری ئەو كۆمەڵگەیە ماركس بە باشی دەزانێت ئەو توخمانەی كە پێكهاتەی ئەو سیستەم و كەلتورەن تاڵ تاڵ و دانە دانە هەڵوەشێنێتەوە[10]. بێگومان پێكهاتەی ئاوا سەرمایەدار، مێژوویەكی ئایینی و فەلسەفی درێژی

لە پشتەوەیە و بەبێ ئاگا ئەو کۆمەڵگەیە کەوتۆتە داوی ئەو ئایدیۆلۆژیایەوە. کێشەکەش لەوەدایە کاتێک هەر مرۆڤگەلێک دەکەوێتە داوی هەر سیستەم و ئایدیایەکەوە، کۆمەڵێک بەرژەوەندی تاک و کۆمەڵ و ماددی و مانەوەی بەو سیستەمەوە دەبەستێتەوە، ناتوانێ بە ئاسانی دەستبەرداری بێت. دەستبەرداربوونیش تێکۆشانی بەردەوام و میتۆدی پڕمانای گەرەکە.

هەر لەو چارەکە سەدەیەدا کە مرۆڤی کورد ناسیۆنالیزمی و ئاینگەرایی تیایدا تەشەنە دەسێنێت، پشکێکی باشیشی لە مارکسیزمی وەبەردەکەوێت. بە تایبەتی پاش ساڵانی ١٩٧٠ لەناو کورددا بیری مارکسیزمی وەک بیرێکی پێشکەوتنخواز و مەدەنی خۆی دەخستە ڕوو. هەروەک ڕێبازی نەتەوایەتی شەرعیەتی خۆی لەو ڕاستیەوە وەردەگرێ کە مرۆڤ پێویستی بە ئینتمای نەتەوەیی هەیە، ڕێبازی ئایینش شەرعیەتی خۆی لەو ڕاستیە وەردەگرێ کە مرۆڤ پێویستی بە تێرکردنی ڕەهەندی ڕۆحی هەیە، بە هەمان شێوە مارکسیزمیش شەرعیەتی خۆی لەوێوە وەردەگرێ

کــە مــرۆڤ پێویــستی بــە شــیکردنەوە و شــەن و کــەوکردنی گرفتــە هەنوکەییــە کۆمەلایەتیەکانــە.
ئەمان پێیان وابوو ڕێگەچارەسەر لە گەڕانەوە دایـە بـۆ ململانـێی چـینایەتی و قـسەکردن لەسـەر کێشە هەنوکەییــە کۆمەلایەتیــەکان و دوورکەوتنــەوە لــە ئـایین. بـە بۆچـوونی ئـەوان ئـاین کۆنەپەرسـتیە و نەتەوایـــەتیش ڕەگەزپەرســـتیە و ســـەردەمیش سەردەمی مرۆدۆستییە.
لـــە هـــەمووان ئاشـــکرایە کـــە مارکـــسیزم لـــە هەلومەرجـــێکی ڕۆژئاواییـــدا هـــەڵقولاوە و پەیوەندیەکی قوڵ و پتەوی بە پرۆسـەی مـێژووی بـە کۆمەلایەتیکردنی ئەو کۆمەڵگەوە بووە. مارکسیزم دەرئـەنجامی ململانـێیەکی قـوڵی فەلـسەفی نـێوان ماتریـالیزم و ئایدیالیزمــە. کاریگــەری فەلــسەفەی کـۆن و نـوێ و ئـایینی یـەهودی و مەسـیحی بەسـەر بیری مارکسەوە دیارە.
مــەخابن مارکـسیە کوردەکـان نـەیانتوانی ئـەم قولایـەی فیکـری مـارکس بگەیننـە نـاو کـورد، بـەڵکو ئـــەوەی ئـــەوان گەیانـــدیان چـــەند ڕووکـــەش و ڕووخسارێک بـوو وەک ناشـرینکردن و سـوککردنی

وەزیفە و ڕەهەندی ئایین. خۆ ئەگەر ئەوان ئەم مەبەستەشیان نەبووبێ بەڵام لە ناو ڕای گشتی و خەڵکانی ئاساییدا بە لایەنگران و نەیارانیانەوە وا کەوتەوە کە گوتاری مارکس گوتارێکی دژ بە ئایین و خوایە و ئەم ئاوزڕاندنەی بیری مارکسی وای لە مرۆڤی کورد گەیاند کە مارکسیزم بانگەوازییە بۆ بێ ڕەوشتی و کورد لەوە بێبەش بوو تا بەم فەلسەفەیە بەهرەمەند بێت. مەبەستم ئەوەنیە کە مارکس پیاوێکی دینداربووە و مارکسیە کوردەکان پێچەوانەی ئەوەیان نیشان داوە، نەخێر، مەبەستم ئەوەیە بۆ مارکس دژ بە ئاین وەستایەوە، گرنگە بزانرێت. چونکە بۆ کۆمەڵگەی کوردەواری ئێمە سەختە قسەکردن لەسەر بێ ئاینی و نەبونی خوا. لەم ڕووەوە ڕەخنەی زۆر لە مارکس گیراوە لە ڕۆژئاوا، وەلێ زۆریش سودی لێوەرگیراوە بۆ ڕاستکردنەوەی چەمکی ئاین وخودا.

**ئایا دەکرا هەڵگرانی بیری مارکسیزم بۆ کۆمەڵگەی کوردی بەجۆرێکی دی سودیان لە فەلسەفەی مارکس وەرگرتایە؟**

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە کارێکی ئەستەمە، لەکاتێکدا کە مرۆڤگەلی کورد نە مێژووی دینی و نە

فەلسەفی بە خۆیەوە دیوە، چۆن لە بیر و بۆچوونی مارکس تێدەگات. هەڵبەتە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە مرۆڤی کورد- بە هەواداران مارکس و نەیارانیشیەوە- هەرگیز لە مارکس تێنەگەیشتون، تەنها ئەوە نەبێ کە خوا نیە و ئایین کۆنەپەرستیە. لە بەرامبەر ئەوانیشدا مارکسیزمی وا ناسراوە کە تەنها بەرەڵلایی و بێ ڕەوشتیە. لەم ململانیەدا مرۆڤگەلی کورد بێبەش بوون لەوەی کە لێکۆلینەوەی زانستیانە بۆ کۆمەلگەی خۆیان بکەن، هەروەک چۆن مارکس و هەوادارانی لە ڕۆژئاوادا جێبەجێیان کرد. هێندەی من لە ڕێبازی مارکسیی لە ناو کوردا تێگەیشتبم، ڕێبازێکی سیاسی بووە نەک زانستی. بەڵگەشم بۆ ئەم بۆچوونەم ئەوەیە کاتێک شیوعییەکان کە خۆیان بە ڕۆڵەی شەرعی مارکس دەزانن، لە ساڵی ١٩٧٤ لە جەنگی نێوان بارزانی و حکومەتی ناوەندیدا، چوونە بەرەی حکومەتی ناوەندیەوە. لە کاتێکدا مارکسیەت پێش ئەوەی ڕێبازێکی سیاسی بێ، ڕێبازێکی زانستی بووە بۆ شیکردنەوە و بەرگرتن لە سیاسەتی بۆرژواکان.

هەروەک بیری نەتەوەیی یەک ئاکە فەیلەسوف و زانایەکی لە پشتەوە نە بوو، بزاڤی ئیسلامی سیاسیش ئاقە سۆفیەک یان عارفێکی نەخولقاند، هەرواش مارکسیزم نە فیکرێک و نە زانایەکی لە ناو کوردا نەئەفراند. بە بۆچونی من ئەوەی ئەم سێ رەوتەی خولقاند گوتار بێژ بوون، گوتاربێژی سیاسی گوتاربێژی ئایینی و گوتاربێژی بیری نوێ. میتۆدی زانستی بۆ گۆڕانکاریەکی جدی لای هیچ لایەکیان دەست ناکەوێ. خۆ ئاهەقیشیان ناگرم نەئاستی نەتەوەیی و نە ئاستی ئاینی و نە ئاستی بیرکردنەوەی نوێ لە ناو کوردا لەو سەردەمەدا لە ئاستێکدا نەبوو بتوانن لە بنەڕەت و ناوەڕۆکی ئەم کێشانە تێبگەن. ئەم سەرنجە تەنها جەماوەری ڕەش و ڕووت ناگرێتەوە، بەڵکو هەڵگرانی ئەو ڕێبازانەش دەگرێتەوە کە هێندە بە ڕووکەش و ڕووخساری ئەو ڕێبازانەوە سەرقاڵبوون، هێندە ئاستی جەوهەر و قوڵایی ڕێبازەکان سەرقاڵی نەکردبوون.

**بۆچی ئایین لای مارکس بوو بە هۆشبەری کۆمەڵگە؟**

لەو سەردەمەی مارکس تێیدا ژیاوە هیچ فەیلەسوفێک نەیتوانیوە لە کاریگەری فەلسەفەی هیگڵ قوتار ببێ. تیۆلۆژەکان گفتوگۆ و وتوویژیان لەسەر ئەوە بووە خودا گەردوونی بۆچی دروستکردووە؟ بۆچی خودا ئەو ماندووبوونەی کێشا تا گەردوون دروستبکات ؟ ئەم گەردونە کە ئەو خوایە دروستی کردوە بۆ پڕە لە کارەسات و تاوانکردن و کەموکوڕی. گەر خودا خۆی کامڵ و تەواوە، ئەی بۆچی دنیایەکی ئاوای لە دەرەوەی خۆی خولقاندووە کەپڕە لە تاوان و گوناه. ئەو کامڵ و تەواوە ئیشی بەو دنیا ناتەواو و نا کامڵە چیە؟ تیۆلۆژەکان هەوڵیان داوە وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە. وەڵامی هیگڵ لەو سەردەمەدا هەتا بڵێی وەڵامێکی نایاب و شاکارانە بوو کە دەڵێ خودا واتە ڕۆحی ڕەها خۆی بەبێ گەردوون نابێتە ڕۆحێکی گەشەسەندووی کامڵ. لێرەدا مەبەستی هیگڵ ئەوە نیە کە هەموو ڕێکخراوێک ڕێکخەرێکی گەرەکە. بەڵکو ئەو مەبەستە گشتیەی هەیە کە گشت کەسێک بێ ئەوەی

بەویدی بگات ناتوانێ خودی خۆی بناسێت. خوداش هەروەک ئەو کەسانە دەبێتە بابەتێکی دەرەکی کە ـخودا خۆی نەبێتـ بۆ ئەوەی خودا لەوەوە خۆی بناسێت و خۆی پێناسە بکات. خودا لە ڕێگەی پەیوەندی کردن بە گەردوونەوە و کارلێکردن لەگەڵ گەردووندا مەعریفەی خودناسین وەردەگرێت. دەرئەنجام ئەوەیە کە چیرۆکی مێژووی مرۆڤایەتی وا لە چیرۆکی خۆناسینی خودا دا، واتە مێژوو، مێژووی خودایەو مرۆڤ بۆ پرۆسەی خودناسینی خودا هاتۆتە بوون، مرۆڤ تەنها ئەکتەرێکەو چیدی نیە. لێرەدا ویستی مرۆڤ و نیازەکانی لە ناو نیازو ویستی خودادا ون دەبن."

هەر لەو سەردەمەدا لە ناوهێگڵە نوێکاندا ئەو بۆچوونە گەڵاڵە بوو بوو، کە ئایینی مەسیحی بە وتەیەکی سادە و ساکار وەهمێک بووە و ئەوانەیش باوەڕیان پێهێناوە هەڵخەڵەتاون. فەیلەسوفێکی وەک فیورباخ پرسیارێک دەوروژێنێت و دەڵێ: ئەگەر ئایینی مەسیحی وەهم بێت چۆن ئاوا کاریگەری لەسەر مرۆڤ دەبێت. وەڵامەکەشی ئەو ئەرگومێنتەیە کە دەڵێ خودا ئێمەی لە شێوەی خۆی

نەخولقاندووە، ئەوە ئێمەین خودامان لە شێوەی خۆماندا خولقاندووە. ئەو مەبەستی لەوەیە کە مرۆڤ هەڵگری توانستێکە کە بەهۆیەوە دەتوانێ لە هێزێکی سنووردارەوە سەرکەوێ تا ئایدیایەکی بێ سنوور بخولقێنێ و ئەو ئایدیایە لە دەرەوەی خودی خۆیدا دامەزرێنێ. بەم ئایدیایەوە دەتوانێ هەموو ئەو خەیاڵ و سیفەتانەشی پێوە بلکێنێ تا بیکاتە خودایەکی لەوچەشنەی هەزاران ساڵە لە ناو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا کاریگەرە. فیۆرباخ دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بڵێت: بۆئەوەی ئێمە هەقیقەتی خۆمان و توانستی ڕاستەقینەی خۆمان بناسین و کۆمەڵگەیەک دروست بکەین کە مرۆڤانە بێت، دەبێ واز لە ئاین بهێنین، تا هیچ بەربەستێک نەمێنێت ڕێگە لە دەرکەوتنی توانستەکانی مرۆڤ لەسەر گۆی زەوی بگرێت."[12]

لێرەدا خوێنەر دەبێت لەوە ئاگادار بێت هێندە باس لەوەیە مرۆڤ خۆی چۆن دەتوانێ لە چەشنی خۆی خودا دروست بکات ( وێنا بکات) هێندە باس لە بوون و نەبوونی خودایەک نیە. وەلێ گرنگ ئەوەیە بگەینە ئەو شوێنە کە چۆن مارکس گەشتە

ئەو بۆچوونەی ئاین بکاتە هۆشبەری کۆمەڵگە.
لێرەدا ئەو مێژووەی پێش ئەوەی مارکس بگاتە ئەو
دەرئەنجامە، دەخوێنینەوە.

ڕەخنەگرتنی فەیلەسوفەکانی پێش مارکس لە
ئاین و ئەو پرۆسەیەش کە بەسەر ئایینددا هات بە
تایبەتی ئاینی مەسیحی و کەرتبونی مەسیحی بۆ
کاسۆلیک و پرۆتستانت و سەرهەڵدانی ئایینی
سۆفیگەریانە بە تایبەتی سۆفییەکی وەک مایستەر
ئیکهارت لە ئەڵمانیا کە کاریگەری لەسەر زۆر لە
فەیلەسوفەکانی پاش خۆی جێهێشت بوو،
فاکتەرێکی گرنگ بوو بۆ کامڵکردنی بیری مارکس.
ئەم پرۆسە مێژووییە مارکسی گەیاندە ئەو
بیرۆکەیەی کە ئاین هۆشبەری کۆمەڵگەیەو بەمەش
ڕەخنە گرتن لە ئاین گەیشتە ئەوپەڕی. واتە
مەبەست و مەرامی ئاین لە مرۆڤ ئاشکرا بوو،
ئەمەش لەو دێڕەدا دەردەکەوێت: مرۆڤ کاتێ بۆ
بەهەشتێک دەگەڕێت ئەوە جگە لە ڕەنگدانەوەی
خەیاڵدانی خودی خۆی هیچ شتێکی دی نیە.
مارکسیش هەروەک فیۆرباخ دەگاتە ئەوەی کە بڵێ
وێنای خودا داهێنراوی هزری مرۆڤە.[١٣] لەگەڵ

ئەوەشدا مارکس بەو وتەیەی هێندەی مەبەستی ئەوە بوو کە پلارو تانە لە سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایینی کۆمەڵگەی خۆی بدات، هێندە ئەو مەبەستەی نەبوو کە دژایەتی ئاین وەک ڕەهەندێکی ڕۆحی بکات. چونکە ئەو پێی وا بوو سیاسەتی ئەو سەردەمە لەسەر پایەی ئاین خۆی ڕاگرتووە. ئەو دەیویست خەڵکی لەوە هۆشیار بکاتەوە کە بڵێ سەبارەت بەوسیستەمە سیاسی و کۆمەڵایەتییەی خۆتانی تێدان، پیاوانی ئاینی و دەسەڵاتدارانی سیاسی ئێوەیان بەناوی ئاینەوە گێل کردووە. هەر لەبەرئەوەش بوو مارکس و هیگڵە نوێیەکان لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە دژایەتی دەکران و ڕێگەیان پێنەدەدرا لەسەر کاری خۆیان بەردەوام بن. مارکس پێی وا بوو مرۆڤ بۆیە ئاینی دۆزیوەتەوە تا فشاری ئازار و مەینەتی و کارەساتەکان لەسەر خۆی کەم بکاتەوە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە دەسەڵاتداران هەمیشە ئەم حاڵەتەیان قۆستۆتەوە، تا بارودۆخی دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن.

کاتێ مارکس ئاین پێناسه دەکا وەک هۆشبەری کۆمەڵگــه، دووجــۆر مەبەســتی تــێدا دەبینیــەوە، یەکێکیان ئازارشکێنه و ئەویتریان ناهۆشیارکردنه، بۆیــه ئــەویش دەیــەوێ مرۆڤــەکان لــەم دۆخــه سـایکۆلۆژییه دژ بـه دەسـەڵاتی سیاسـی ئـەو کاتـه، هۆشـیارکاتەوە. ئـەو پێی وایـه بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ خۆی به ئازایانـه بـەرەنگاری ئازارەکـانی ببێتەوەو له دۆگما قوتار ببێ، دەبێت له ژێر بـاری ئـایین بـێته دەرەوە. ئــەم بۆچــونانه ســەبارەت بــه ئــاین لــه ســـەردەمی پۆستمۆدێـــرنەدا ئاراســـتەیەکی تـــری وەرگرتوەو خوێندنەوەیەکی تری بۆ ئاین هێناوەته کایــەوە و ڕەخنــەی فەیلەســوفەکانی مۆدێــرنه و بەتایبـەتی ڕەخنـەکانی مـارکس سـەبارەت بـه ئـاین ڕەتدەکاتەوە. وەلێ ئـەوەی گرنگـه و تاهەنووکـەش فەلسەفه و زانایان لەسەری کـۆکن ئەوەیـه کـه ئـاین دەشێ لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە بۆ مـەرامی تایبـەتی ئیستغلال بکرێت و مارکسیش لەو سـەردەمەدا جێی خۆی بووە ئەو ڕەخنەیه له کۆمەڵگەی خۆی بگرێت. مارکس گەیشتبووە ئەو دەرئەنجامەی که ئاین جگـه لــه بــێ هۆشــکردن هــیچ ڕۆڵــێکی تــری نیــه. ئــەم

بۆچوونەشی دەرئەنجامی ئەو کۆنتێکستە بوو کە کۆمەڵگەی ڕۆژئاوای لەو کاتەدا تێدا بوو، بەرهەڵستیی ئەو سیستەمە سیاسیەی دەکرد کە زۆرجار بە پاڵپشتی ئاین مرۆڤەکانی دەستەمۆ کردبوو. دیارە بڕیارێکی لەم چەشنە هێندە بڕیارێکی پەرچەکرداری سەردەمی خۆی بووە هێندە ئەقڵانی و زانستیانە نەبووە. چونکە ئاین کە لەسەرەتادا سەرهەڵدەدات، جۆرێکە لە هوشیاری لەو سەردەمەدا دژ بە سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی. کەواتە ئێمە لەو لایەنەوە کە ئاین دەشێ مرۆڤ گێل بکات و بێهۆشی بکات لە گەڵیدان، بەڵام ئاین هەر لەبنەرەتەوە ڕەتکرێتەوە ئەوە لەگەڵیدا هاوڕانین.

**بۆچی مارکس ڕێبازی ماتریالیستی هەڵبژارد؟**

گەر لە سەرەتای مێژووی فەلسەفەی مۆدێرنەوە دەست پێبکەین و بمانەوێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە، ئاوا دەستپێدەکەین:

بنەمای پەیوەندی نێوان خود و گەردوون چیە؟ پرسیارێکی جدی ناو فەلسەفەیە و هەر ڕێبازێکی

فەلسەفی وەڵامی تایبەتی خۆی هەیە و لەویدی جیای دەکاتەوە. لێرەدا بەو وەڵامە بەناوبانگەی دیکارت دەست پێدەکەین کە دەڵێ: ڕۆحی مرۆڤ پێکهاتەیەکی فیکری هەیە، بەڵام جەوهەری گەردوون جەوهەرێکی ماددیە کە لە شوێندا جێگە دەگرێت. بەڵام فیکر لە شوێندا جێگە ناگرێت و بێ قەبارەیە. لەم بۆچوونەدا ڕادیکالانە ڕۆح و گەردوون لە یەکدی جودا دەکرێتەوە و ڕۆح دەبێتە ئەو شتەی بریتیە لە بیرکردنەوە و دەکرێتە شتێکی سەربەخۆ و جیادەکرێتەوە لەو گەردوونەی کە ماتریاڵە. پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە ئەگەر گەردوون نەبێت مرۆڤ چۆن دەتوانێ مەعریفەی تری جیا لە خودی خۆی بزانێت. هەرکاتێ مرۆڤ گومانی بۆدروست بێت سەبارەت بە بوونی کۆنکرێتی گەردوون، چۆن بەرەو ڕووی ئەم گرفتە دەبێتەوە؟ دیکارت پێی وایە مرۆڤ بەناچاری پەنا دەباتە بەر خوایەکی ڕاستگۆ کە هەڵخەڵەتێنەر نیە، تا لەم گرفتە قوتار بێت. خۆ ئەگەر ئەم خودایە ڕەتکرایەوە هەروەک لای زۆر لە فەیلەسوفەکان

ڕویداوە، ئەوا دەکەوینە ناو جیهانێکەوە یەکپارچە دەبێتە خودگەرایی.[١٤]

لـە بەرامبـەر ئایـدیالیزمی یـان خوداگـەرایی دیکـارت، ماتریـالیزمی یـان بابەتگـەرایی تۆمـاس هـۆبس لـە ئـارادا بـوو. هـۆبس وای لـە مـرۆڤ دەڕوانی کـە یەکپارچـە جیهانـێکی ماتریالـە. بـەم بۆچـوونە بـوونی مـرۆڤ وەک گـشت شـتەکانی تـر لەسـەر بنـەمای یاسـاکانی سروشـت دامـەزراوە و دۆزی فەلسەفی گرفتێکی زانستی ڕووتەو هیچی تر. لێرەدا ئەگەر ئەو بۆچونە زانستیە وەرگیرێت کـە جیهان جیهانی مۆلکیوڵ و ئەتۆمە، ئەو گرفتە یـان ئـەو پرسـیارە سـەرهەڵدەدات کـە دەڵـێ: ئـەدی چـی دەمێنـێتەوە بـۆ چـەمکەکانی وەک ئەقڵانیـەت، مـوراڵیتی، ئـازادی و ویـستی مـرۆڤ. بـۆ نموونـە چـاک لای هـۆبس ئـەو شـتانەیە کـە مـرۆڤ خوازیاریـەتی، خوازیـاریش جوڵەیـەکی نـاوەکی مرۆڤـە. واتـە مـۆراڵیتی بریتیـە لـە جوڵەیـەکی ناوەکی.[١٥]

لای ماتریالیـستەکانیش ئـەو بۆچـونە زۆر تـۆخ کرایـەوە، کـە مـرۆڤ بوونـێکە بەرهـەمی

دەوروبەریەتی، کە ئەگەر ژینگە گۆڕرا ئەوا ڕەفتاری مرۆڤەکەش دەگۆڕێ. بۆیە هەندێک زانا دەیانویست ژینگە باشتر کەن تا ڕەفتاری مرۆڤ چاکتر بێ. ئەم بۆچوونە وا لە مرۆڤ دەڕوانێ کە مرۆڤ بە تەواوەتی بوونێکی موسەیەرەو هیچ ئیرادەیەکی ئازادی نیەو گشتی بە دەوروبەریەوە بەستراوەتەوە. لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە چۆن مرۆڤ لە کۆتی موسەیەر ئازاد بکرێت. هەندێک زانا پێیان وابوو هەمیشە چینێک لە مرۆڤ هەن کە ناکەونە ژێر کۆت و باری موسەیەرییەوەو بەبەردەوامیش لە بیری ئەوەدان کە دەوروبەر بگۆڕن، ئەوانەش زۆرینەی خەڵکی نین بەڵکو کەمینەن.

لێرەدا مارکس هۆشیار دەبێتەوە و ڕەخنە لەم بۆچوونە دەگرێت و نەشتەری خۆی لێ دەوەشێنێت. چونکە ئەم بۆچوونە کۆمەڵگا دەکات بە دوو چینەوە، چینێکی کەمینەی دەسەلاتدارو سوپەریۆرو لەسەرووی کۆمەڵگەوە دەوەستێت و دەتوانێ قەدەری زۆرینەکەی کۆمەڵگە بگۆڕێت. لای مارکس ئەم فەلسەفە ماتریالیستیە نەک هەر تەنها

پڕ لە دژواریە بەڵکو لەخزمەتی بۆرژواکانە. مارکس ئەمەی بە ماتریالیزمێکی ناتەواوو نەگەیو دادەنا. هەروەها فەلسەفەی دیکارتیش ڕەتکردەوە کە بوون دەکات بە دوو بەشەوە: ڕۆحی و ماددی. ئەم فەلسەفەیە دەڵێت کە ڕوح هەروەک کامێرایەک زانیاریەکان لە جیهانی دەرەوە وەریدەگرێت و تۆماری دەکات.[١٦]

بۆ مارکس گرفتی ئەم فەلسەفەیە ئەوەیە کە ڕۆح لە بارێکی پاسیڤدایە. ئەم بۆچوونە ئەوە پشتگوێ دەخات کە مرۆڤ لەم جیهاندا بوونێکی ئەکتیڤەو دەتوانێ سروشت و ئەوەی دەبینێ بگۆڕێت. زۆربەی ئەو شتانەی لەلایەن یەکێکەوە لەم جیهانەدا دەبینرێت هەروا بە سادەیی ئەوە نیە کە لەوێدایە، تا ئەو یەکە بتوانێ هەروا بە ئاسانی لێی ووردبێتەوە و ئۆبسەرڤێرەی بکات. چونکە ئەو شتە بە هۆی تێکۆشانی مرۆڤەوە جا بە هەچ ڕێگایەک بووبێ، پێش ئەوە دروستکراوە یان بەلانی کەمەوە ترانسفێرمێرکراوە، واتە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. کورتیەکەی ئەوەیە کە مرۆڤ لای مارکس بوونێکی ئەکتیڤە نەک

وەرگرێکی پاسیڤ. لێرەدا مارکس قەرزاربارى فەلسەفەی ئیدیالیزم دەبێت بە تایبەتی فەلسەفەی ئیمانویل کانت کە بۆیەکەمجار دەرکی بەم مەسەلەیە کردووە. لەم بۆچوونەدا کە مارکس ئەکتیڤبوونی مرۆڤ ئاشکرا دەکات بە سیستەماتیک قسە لەسەر ئەو لایەنانەی مرۆڤ دەکات. لە شرۆڤەکانیدا توخمەکانی فەلسەفەی کانت دەبینرێتەوە. لەو بۆچوونەدا مارکس دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە بڵێ خودی مرۆڤ خۆی جیهان دروست دەکات، واتە جیهان دەستکردی مرۆڤە. بەڵام مارکس بەوەشەوە ناوەستێت و کانتیش تێدەپەڕێنێت، ئەویش بە هۆی کاریگەری فەلسەفەی دیالیکتیکی -هیگڵ- کە باوەڕی وا بوو تەنها مرۆڤ کاریگەری لەسەر گەردوون نیە بەڵکو گەردوونیش کاریگەری لەسەر مرۆڤە، واتە گەردوون و مرۆڤ بە بەردەوام کارلەیەکتر دەکەن. ئەم پرۆسەیەش ناو نرا دیالیکتیک. بە بۆچونی مارکس هەرچەند هەقیقەت لای کانت و هیگڵ هێشتا شێواوەو ڕوون نەبووەتەوە، وەلێ ئەوان هەنگاوی گرنگیان ناوە بۆ ناسینی ئەو هەقیقەتەو

هیگڵ تا ڕادەیەکی باشتریش لە هەقیقەت نزیک بووەتەوە. بەڵام ڕەخنەی مارکس لە هیگڵ لەوەدایە کە تێکڕای شتەکان لای هیگڵ تەنها لە فیکر وزیهندایە نەک لە زەمینەی واقعدا. ئیدی لێرەوە مارکس نارەزایی خۆی بەرامبەر بە ئیدیالیزمیش ڕادەگەیەنێت.[17]

مارکس هەروەک لە ئایدیالیستەکان ڕازی نەبوو هەرواش لە ماتریالیستەکانیش ڕازی نەبووە. چونکە ماتریالیستەکان بە پێچەوانەی ئیدیالیستەکانەوە هیچ ڕۆلێکیان بۆ لایەنی ڕۆحی و ئیرادەی مرۆڤ، نەهێشتبووە و گشت پێکهاتەی مرۆڤیان لە ناو گەردون و دەورووبەردا وونکرد بوو. مرۆڤ وەک ڕۆبۆتێک وا بوو، خۆی هیچی بەدەستەوە نەبووە. مرۆڤ کاتێ دنیا دەگۆڕێ لە هەمان کاتتدا خۆشی دەگۆڕێ. گۆڕانکاری هەر لە فیکردا نیە بەڵکو لە کۆمەڵگەشدایە، کە بە هۆکاری ماتریالیەوە لە ڕێگەی پاچ و خاکەناز و شۆفڵەوە. نموونەی مارکس لێرەدا چینی کرێکار و هێزی کار و بەرهەمهێنانە.[18]

لیرەدا تێدەگەین بۆ لای مارکس کرێکار هێندە گرنگەو نامۆبوونی کرێکاریش لە سیستەمی سەرمایەداریدا بەهەند وەردەگرێت!! مارکس پێی وایە هەندێ شت لەسیستەمی سەرمایەداریدا هەڵەیەو ڕێگرە لە بەردەم مرۆڤدا بۆ ئەوەی هەقیقەت و توانستی خۆی وەدی بهێنێت. مەبەستی مارکس لە نامۆبوونی کرێکار ئەو مەبەستە نیە کە مرۆڤ ئاراستەی ناخی خۆی لێشێواوەو هەستی ئینتمای بۆ ئەو شوێنە نیە کە تێیدایە، ئەگەر چی ئەم نامۆبوونە لەمەش بەدەر نیە. واتە مەبەستی مارکس لە نامۆبوون هێندە مەبەستێکی بابەتگەراییە هێندە خودگەرایی نیە. مارکس پێی وایە چارەنوسی مرۆڤ لە ژیانیدا بە بێ ڕیالیزەکردنی هەقیقەت، نامۆبوونە. بۆ کەمکردنەوەی سانسۆرو ئازاری نامۆبوون، مرۆڤ ناچارە ئایین بخولقێنێت.

ئەم دیباتەی پێشوو کە خستمە ڕوو سەبارەت بە مارکسیزم و ماتریالیستی و و ئیدیالیستی دڵۆپێکە لە دەریایەک. دەتوانی بڵێی لەوەتی مرۆڤ هەیە ماتریالیستی و ئیدیالیستی لە گفتوگۆدان. بەلام

ئاراستەو ئاستی ئەو گفتوگۆیە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر یان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێ. مەبەستی من ئەوەیە کە مارکسیزم هاتە ناو کوردەوە ئەم دیباتەی کە ئاماژەم پێدا، بەدی نەکرا ئەگەر چەمکی ماتریالیستی و ئیدیالیستی زۆر دەخرایە ڕوو، وەلێ هەرگیز بەو ئاستە قوڵە نەبووە کە لە ڕۆژئاوادا بەدیکراوە. چونکە کورد ئەو کاتە نەگەشتبوە ئاستی ئەو گفتوگۆیە ئەگەر ئێستەش بگاتە ئەو ئاستە، ئەوا ئاستی گفتوگۆکە بۆ ئەم سەردەمە نزمە.

## کورد و مارکسیزم

لەناو کورددا کەسانێک بوون هەوڵیانداوە لە فەلسەفەی مارکس و لینین بەهرەمەند بن، بێ ئەوەی تایبەتمەندێتی نەتەوەیی کورد وەلانێن. دیارە ئەگەر بە شێوەیەکی سادەش بووبێت، هەڵگرانی ئەم بیرە دەرکیان بەوە کردووە، کە کورد دەبێت خاوەن فەلسەفەو دید و تێڕوانین و جیهانبینی سەربەخۆی خۆی بێت. لەگەڵ ئەو ڕاستگۆییەی ئەو کەسانە بوویانە، وەلێ دوو کەلێنی

گەورە لە بیرکردنەوەیاندا بووە. ئەو دووکەلێنەش هۆیەکی مەزن بووە بۆ بەرەوپێش نەچوونی پرۆژەی ئەم ڕێبازە. یەکەم کەلێن پەیوەندی نێوان فەلسەفەی مارکس و ئاستی هوشیاری نەتەوەی کوردەو دووەمیان چۆنیەتی مامەڵەکردنی ئەم ڕێبازە بووە لەتەک ئاییندا.

فەلسەفەی مارکس و ئایدیای ئاینی پەیوەندیەکی ئۆرگانی پتەو پێکەوەیان دەبەستێتەوە، وەک لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا. ئەو پەیوەندیەی لە ڕۆژئاوادا ئەم دوو دیدەی پێکەوە بەستبووەوە، تەواو پێچەوانەی ئەو پەیوەندیە بوو کە ڕێبازی مارکسی دەیویست ئایین و فەلسەفە پێکەوە گرێ بدات. لە ڕۆژئاوا ئاراستەی پەیوەندیەکە بەم شێوەیە بوو: گۆڕانکاری لە جەوهەری ئاییندا، دەبووە هۆی سەرهەڵدانی فەلسەفەیەکی نوێ، نەک بە پێچەوانەوە، واتە ڕێبازێکی فەلسەفی بێت و بیەوێ ئایین کەنارخات یان بیگۆڕێ. ئەوە بوو گۆڕانکاری لەجەوهەری ئایینی مەسیحیدا مارکس و فەلسەفەی مارکسی گەیاندە ئەو تێزەی بڵێ (ئاین هۆشبەری کۆمەڵگەیە). وەلێ فکری مارکسی لەمەڕ

خۆمـــان دەیویـــست بەفەلـــسەفە بیسەلمـــێنێ ئـــاین ئەفـــسانەو وەهمـــە. لـــەم ململانـــێیەدا فەلـــسەفە شکستدەهێنێت. بۆیە ئەم هەوڵە کاڵی و کورتبینی هـــەڵگرانی دەخاتـــەڕوو. ســـەرەڕای ئـــەوەی گومـــان هەیـــە لـــەوەش کـــە ئـــەم ڕێـــبازە توانیبـــێتیان لـــە جەوهـــەری فەلـــسەفە تـــێبگەن. وەک بـــزانم هـــەر دەروێشانە قسەیان لە سەر فەلسەفە کردووە نەک زانستیانە.

ئـــەم ململانێیـــەی نـــێوان ئـــاین و فەلـــسەفە لـــە ڕۆژئاوادا، نزیکەی چوارسەدەی خایاندووە، تا لە هـزری تاکە هوشیارەکانی کۆمەڵگاوە دابەزیوەتە نـــاو هـــزری جـــەماوەری ئـــەو کۆمەڵگەیـــەوە. خـــۆ مـەرجیش نیـە ئـەم ئەزمونـە کـە لـە کۆمەڵگەیەکدا هـێندەی خایاندبـێت لـە لایەکیتریـشەوە هەردەبـێت هـێندە بخایەنـێت. نەخـێر، چـونکە ئـەو ئەزمونـەی ڕۆژئاوا پلانێکی تایبـەتی بـۆ نەکێشراوە، بـەڵکو بـە چەشنـێکی ئاســایی و وەک پرۆســەیەکی مـێژوویی گەشـــەی کـــردووە. هـــەروەک چـــۆن دیاردەیـــەکی زانستی سەدان ساڵ دەخوازێت تا ئاشکرا دەکرێت. وەلێ پاش ئاشکرابوونی ئەو دیاردەیە مرۆڤ خۆی

دەتوانی بەکورترین ماوە لە شوێنێکی تردا یان لە کۆمەڵگەیەکی تردا، هەمان پرۆسە دووبارە بکاتەوە، چونکە یاساکانی ئەو پرۆسەیە بۆ مرۆڤەکان ئاشکرا بووە. بۆ نمونە زانستی بارانبارین، لەقامچی لێدانی فریشتەوە تا گەشتە زانستی ئیمرۆ زۆری خایاندووە، وەلێ هەنووکە بە چەند ساتێک زانایان دەتوانن باران لە تاقیگادا ببارێنن. هەمان یاساو رێسا کە لە پرۆسەی گۆڕان لە دیاردە زانستیەکاندا هەیە دەگونجێ لە ناو پرۆسەی گۆڕان لە دیاردە کۆمەلآیەتیەکانیشدا وەکار بخرێتەوە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی هەلومەرجی ئەو کۆمەڵەی ئەو پرۆسەیەی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت.

هەڵەیەکی تری ئەم کەسانە ئەوەبوو کە لەتەک ئاییندا نەیانتوانی زانستیانە مامەڵە بکەن. نەتەوەیەکی وەک کورد کە لەناو جیهانی ئیسلامیدا دەژی و لەرووی هزری ئایینیەوە تاهەنوکە لە سەدەی ناوەراستدا دەژی، چۆن دەکرێ فەلسەفەیەکی بۆ بگوێزیتەوە کە خۆی بەو پرۆسەیەدا تێنەپەڕیبێت تا بزانێ چ باسە. سەرەڕای

ئەوەی پێشرەوانی ئەم ڕێبازە خۆیان تا ئێستاشی بێتە سەر بەو پرۆسەیەدا تێنەپەڕیون. ئەی چۆن پرۆسەیەکی ئاوها دەتوانرێ بکرێتە پرۆژەیەک کە لەگەڵ ئاستی هوشیاری ئەو نەتەوەیەدا نەگونجێت. گونجاندن، پێشوەخت تێگەشتن دەخوازێت، تا هەنگاو بەهەنگاو ئەو نەتەوەیە بەرەو پێش بەرێت. واتە چۆن کەسێک خۆی ئاینی نەناسیبێت دەتوانێ دەسکاری ئاین بکات!!

گەر بە مێژودا بچیتەوە، سەرنجی ئەوە وەردەگرێت کە هەمیشە دەسکاریکردنی ئاین، دەسکاریکردنی چەمکی خوایەتی دەخوازێت. دەسکاریکردنی چەمکی خوایەتیش، دەسکاری لە پێشدا نەست و پاشان هەستی ئەو کۆمەڵگەیەی گەرەکە. ئەم دەسکاریکردنانەش پرۆژەیەکی زانستیانە و ماندووبونی چەندین ساڵی دەوێت تا ئامادەبکرێت. ئەو زانستانەی کە زۆر گرنگن بۆ ئەم جۆرە پرۆژەیە و بۆ نەتەوەیەکی دواکەوتوو و پاشکۆی نەتەوەکانی دی وەک کورد بریتین لە؛ فەلسەفە، ئاین، گەردوونناسی و دەروونناسی. ئەم پرۆژەیە پێویستی بە زوورێکی عەمەلیاتەو دیبات و

لێدوان و گفتوگۆیەکی زۆر چڕوپڕ دەخوازێت، تا ئایدیایەکی وا بخەملێنرێت کە نەتەوەی کورد بتوانێ خۆی لەسەر ڕاگرێت. بۆ ئەو چوار زانستە لەم ساتە وەختە گرنگە، نامەوێ لێرەدا درێژەی بدەمێ. هەرکاتێ ئەو ژووری عەمەلیاتە سازبێت، مرۆڤ دەتوانێ لەوێدا شتەکان ڕوونتر بکاتەوە. لێرەشدا مەبەست بێ ئاینی کردنی کورد نیە، هێندەی بە زانستی کردنی ئەومامەڵەیەیە لەتەک ئایندا. لە هەمان کاتیشدا مەبەست گەڕانەوە نیە بۆ ئاینێکی دی ڕابورد و وەک هەندێک لە کورد لەمەر ئاین بۆی دەچن.

مەبەستی سەرەکی کارلێکردنی ئەو چوار زانستە (فەلسەفە، ئاین، گەردوونناسی و سایکۆلۆژیا) لە تەک یەکدیدا ئەوەیە کە زانایانی ئەو زانستە بتوانن لەگەڵ یەکدی بەبەردەوام لەو ژووری عەمەلیاتەدا، قسە لەسەر هەقیقەت بکەن و چیرۆکێکی زانستی بۆ ژیان و مانای ژیان و ڕێبازێکی مەعریفی و عیرفانی لەوێدا بۆ کورد داڕێژنەوە. دەشێ هەرناوێک لەو پرۆژەیە بنرێت کە گوزارشت لە ئێمرۆی هەل ومەرجی کورد بکات.

بەراستی کورد گەشتۆتە ئەو ئاستەی لە سەرکردایەتی سەرکردەی جەنگاوەرێکی سیاسیەوە بگوێزرێتەوە بۆ عارفێکی سیاسی. تا هەنوکەش سەرکردەکانی کورد جەنگاوەرێکی سیاسین و نەتەوەی کورد لەوە زیاتر بەرگەی ئەم جۆرە سیاسەتە ناگرێت.

ئەوەش بە پێویست دەزانم بیڵێم ئەوەیە کە مەرج نیە کورد خۆی بەتاکە فەلسەفەیەکەوە سەرقاڵ کات، چونکە فەلسەفەش وەک هەر پرۆسەیەکی دی کۆمەڵایەتی ناکرێ لە کەسێکدا یان لە جۆرە ڕێبازێکی فەلسەفی تایبەتیدا، گیربخوات. فەلسەفەش بەبەردەوام لە گۆڕاندایەو دەبێ خەمخۆری نەتەوەی کورد ڕەچاوی ئەم هەلومەرجە بکات، دەنا لە بری سود، زیان بەو نەتەوەیە دەگەیێنێت. جیاوازییەکی زۆر لە نێوان فەلسەفەی کۆن و سەدەی ناوەراست و فەلسەفەی ئیسلامی و مۆدێرنەو پۆستمودێرنەدا بەدی دەکرێت، گەرچی خاڵی هاوبەشیش لە نێوانیاندا هەیە. دەبێ ڕەچاوی ئەوە بکرێت کە مرۆڤ کائینێکی دینامیکیەو ناتوانێ لە قاڵبێکدا یان فەلسەفەیەکدا هەتا هەتایە

گیربخوات. بۆیە ناکرێت خەمخۆرانی کورد بەتەمای ئەوەبن کە تاکە فەلسەفەیەک یان زانستێک ڕێنیشاندەریان بێت. بۆیە زۆرگرنگە ئەم قۆناغەی بیری ئەوڕۆکەی مرۆڤایەتی دیاریبکرێت، تا کورد بتوانێ لەقۆناغێکی هاوچەرخدا خۆی بدۆزێتەوە.

# پەراوێزەکان

1، J.J.M. van Dijk، *Actuele Criminologie*، Denhaag 2002، p.265-266.

2 Ella Wijsman، Groningen 1996، *Psychologie en Sociologie*، p.12.

3 Actuele Criminologie، p.274.

4 هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٢٧٨

5 Tussen Dader en slachtoffer، centrum voor psychologie en relatievorming، http://users.skynet.be/kern.

6 هەمان سەرچاوە

7 هەمان سەرچاوە

8، Willem Zuidema، *Godspartner ontmoeting met het jodendom*، Baarn 1998، p.175-180.

9 ئازاد قەزان، *دیموکراسیبوون*، هەفتەنامەی هاولاتی، ژمارە ٣٧٧، ٢٠٠٧

10 Jonathan Wolff، *Why read Marx today?*، Oxford 2002 / p. 13.

11 هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١٥

12 هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١٧-١٨

13 هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١٨

14 هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٢٢

15 هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٢٢

16 هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٢٢

17 هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٢٦-٢٧

18 هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٢٧-٢٨

# سەرچاوەکان


١. Ella Wijsman، *Psychologie en Sociologie*، Groningen 1996.

٢. Jonathan Wolff، *Why read Marx today?* Oxford 2002.

٣. J.J.M. van Dijk، *Actuele Criminologie*، Denhaag 2002.

٤. Tussen Dader en slachtoffer، http://users.skynet.be/kern، centrum voor psychologie en relatievorming.

٥. Willem Zuidema، *Godspartner*، *ontmoeting met het jodendom*، Baarn 1998.

٦. دیموکراسیبوون، هەفتەنامەی هاولاتی، ژمارە ٣٧٧، ٢٠٠٧

## سوپاس و پێزانین

لێرەدا بەهەلی دەزانم کە سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی هەموو ئەو دۆست و بەڕێزانە بکەم کە دوروو نزیک سەرنجی خۆیان سەبارەت بەجوانکردنی کتێبەکە داوە، بەتایبەتی کاك نەورەس هونەرمەندی کورد لە هۆلەندا کە بەرگێکی قەشەنگی بۆ کتێبەکە کێشا، کاك ئازاد خۆشناو کە ئەرکی چاپکردنی خستە ئەستۆی خۆی و خۆشەویستیەکی بێپایانیشم بۆ هاوسەری ئازیزم کە لەگەڵ هەموو نوسینێکدا شەونخونیم لەتەکدا دەکێشێت.

ئازادقەزاز

جگە لە مرۆڤ گشت بوونەوەرێکی دی ئاراستەیەکی یەک ڕەهەندی دەخوازێ، ئەویش ڕەهەندی ماددییە یان بە زمانێکی تر ڕەهەندێکی غەریزی، بایەلۆژی، فیسیۆلۆژییە کە گشت ئەمانە دەخرێنە ژێر کۆنتڕۆڵی ئاقیگاوە و دەکرێ لە دیدی زانستێک لە زانستەکان مامەڵەی لەتەکدا بکرێت. مرۆڤ جیا لەم بوونەوەرانە جگە لەو ڕەهەندە ماددییە، ڕەهەندێکی دی سەرتاپای ژیانی داگیر کردووە و دەتوانین بە زمانی سایکۆلۆژی وشەی هەست و نەست و بە زمانی ئاین وشەی ڕوح و بە زمانی فەلسەفەش وشەی مەعریفەی بۆ بەکارهێنین. ئەم ڕەهەندە هێندە کاریگەرە، دەتوانم بڵێم ئاراستەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بگرە ئابووری مرۆڤایەتیش دیاریدەکات. لێرەدا لەمەوێ ئەوە بڵێم کە کورد لەو ڕۆژەوەی وەک بوونەوەرێکی کوردی لە مێژوودا سەری هەڵداوە، تا هەنووکەش نەیانتوانیوە ئەو ڕەهەندە ئەبار بکات و هۆشیارانە مامەڵەی لەتەکدا بکات. دەرەنجام شکستهێنانەو، ئەمجا پرسەگرتنە و هەڵسەنگاندنیش ئاوانبار کردنی ئەوییە و بەزەیی هاتنەوەیە بە خۆدا و سەرهەڵدانی هەستی بەقوربانیبوونە.